وەزارەتی رۆشنبیری
بەرێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان
زنجیرە (33)

# مەولانا خالیدو
# تەریقەتی نەقشبەندی

و پێشەکییەك بۆ دیوانی شاعیری کورد وەفا (شێخ عەبدو رەحمانی کوڕی شێخ سراجودینی نەقشبەندی/ 1284-1353ی کۆچی)

سەید محەممەد تاهیر سەید زادەی هاشمی
وەرگێڕانی لە فارسییەوە :
دلێر میرزا

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

**وەزارەتی رۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان**

www.roshnbiri.org

khanaywargeran@yahoo.com

- ناوی کتێب: مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی
- نووسینی:سەید محەممەد تاهیر سەید زادەی هاشمی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: دلێر میرزا
- تایپ و نەخشەسازیی کۆمپیوتەر: شیلان نوری
- نەخشەسازیی بەرگ: نازەنین ساڵح
- زنجیرە: (33)
- تیراژ: 1500 دانە
- ژمارەی سپاردنی ( 34 )ی ساڵی (2004)ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە
- چاپ: چاپخانەی قانع



- چاپی یەکەم: 2004- سلێمانی

# پەیڤێك

سالانی 1985 تا 1991 هەرکاتێك دەچووم بۆ کرماشان, دەبوا سەردانی خاڵە سەید تاهیر بکەم لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی ئیلاهیە.

ئەو زاتەم ساڵی 1985 ناسیوە و دووربەدووریش ئاشنای کەسایەتی و پلەی زانستی و ئەدەبی ئەو پیاوە بەتوانایە بووم.

جارێك لە خزمەتیدا بووم, رووی دەمی کردە ئەو خەڵکەی لەوێ بوون و فەرمووی: راستی کورگەلی ئەودیو قەرزاریان کردووین, تەماشاکەن, ئەوان پێشمەرگەو ئاوارەو ماڵ وێران کەچی زەحمەتی دیدەنی پیرێکی ئوفتادەی وەکو من دەکێشن, بۆ بیستنی دوو قسەی بێ کەڵکم, بەرامبەر بەو هەموو لوتفەی ئەوان منی بێ توانا چیم پێ دەکرێت, جگە لە خۆش ویستنییان و دوعای خێر. سا وەڵڵا ئومێدم زۆرە پێیان..

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

ماموستا ئەوەی لە تەوازوعەوە دەفەرموو. ئەو تەمەنی لە سەرووی هەفتا ساڵەوە بوو. پیاوێکی کەڵەگەتی رێکپۆشی بە هەیبەت و روو خۆش و قسەزان, لە ئەدەبی کوردی و فارسی و زانستی ئاینی وخەت خۆشیدا شارەزاو پسپۆڕ بوو.. و لەنێوان ئەدیب و شاعیرەکوردەکاندا, مەولەوی ناسێکی پلە یەك بوو, لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاییەکی تەواوی هەبوو, لە شیعر و تەریقەتی شیعری نالیدا.

زاراوەی (گۆران)ی کوردی زۆر بەباشی ئەزانی, بە نووسین و ئاخافتن, لێکۆڵینەوەو باسی وردی هەبوو دەربارەی ژیان و شیعری بێسارانی و میرزای پاوەیی و شاعیرانی ئەهلی هەقی دەوروبەری کرماشان.

ماموستا لە کاتی وتو ورێژدا, سیمای روومەت و چاوەکانی و ئیشارەتی دەستەکانی سەرنجی رادەکێشا. ئەو لە سەرخۆ و زۆر بە هێمنی دەستەکانی دەجوولاندو وئاماژەی بۆ بەرامبەرەکانی دەکردو بە دەنگێکی سازگار و زمانێکی کوردی پاراو تێکەڵ بە هەندێ زاراوەی جوان و رەسەنی ناوچەی جوانڕۆوروانسەر دەدواو ناو بەناویش دەوەستا و تەماشایەکی دۆستانەو پڕ لە خۆشەویستی بەرامبەرەکەی و دەوروبەری دەکرد, رێزی زۆری بۆ راو بۆچوونی کەسانی ئامادەبووی مەجلیسەکەی دەگرت و وای دەکرد ئازادی تەواو وەربگرن لە دەربڕیندا.

هەرگیز تەعەسوب و دەمار گیریم لە راوبۆچوونی خاڵە سەیددا هەست پێ نەکردووە.

مامۆستا بەسەرهات و باس و بیرەوەری گرنگی لا بوو. بەداخەوە نەڕەخسا کاتی خۆی هەموو ئەو بابەتە بەکەڵکانە بنووسمەوە, هەندێکیان نەبێت کە وەکو خۆی فەرموویەتی لێرەدا دەینووسمەوە:

((لە یادم نییە بەتەواوی کەی بوو, بەڵام دەبێ لە نێوان ساڵانی 1920-1925دا بووبێت. بۆ سەردانی حەزرەتی غەوسی گەیلانی لێرەوە سەفەرێکمان هەست پێکرد. ئەوسا سەفەر بە سواری ولاخ بوو, لای خزمانی (سۆڵە)ی قەرەداغ ماوەیەك ماینەوەو, هەروا لە (چرچە قەڵا)ی ئەو دیوییش, بە دیداری خزمو دۆستان شاد بووین. وەرزی بەهار بوو ئەو دەشتو هەردانەی نێوان چرچەقەڵاو (سەلاحیە-کفری) زۆر جوان هاتنە بەرچاوم. لە (شاکەل) بۆ دیداری خزمان و حەسانەوە لامان داو پاشان بەرەو شاری کفری و عەسرانێك گەیشتین. کفری شارێکی پۆشتەو پڕ لە دارو ئاوەدانی بوو. شەوێك لە مزگەوتەکەی سەر چەمەکە ماینەوە. ویستگەی (قەتار- شەمەندەفەر) لە باشووری شارەوە, چەند سەعاتێك دوور بوو. لەوێوە بە قەتار چووینە بەغدا.

*ساڵی 1341ی هیجری-قەمەری, مەحمود پاشای جاف و شێخ حسێنی چرچەقەڵا و مەلا شێخ بابارەسولیان هێنایە دێی (زەڵەڕەشی) بناری قەرەداغ, تەکیەو مەدرەسەیان بۆ دروست

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

کرد. ئەو کات مەلا عەبدولکەریم کە دوایی بە مەلا عەبدولکەریمی مودەریس شۆرەتی پەیدا کرد, لەوێ فەقێ بوو, بەڵام تەمەنی ئەوەندە نەبوو لە مەجلیسی مامۆستا باباڕەسوڵدا دابنیشێ.

*لە ساڵانی 1321 و 1322ی شەمسیدا. وتارمان بۆ گەلاوێژ ئەنووسی و لە رێگای بەرێزان (ئیبراهیم نادری و ئازادی نوری سنەییەوە) رەحمەتی خوایان لێ بێت, گەیشتە بەغدا. گۆڤاری گەلاوێژیش بە هەمان رێگا دەگەیشتە ئێمە.

*ساڵی 1324ی شەمسی سەدری قازیم لە تاران بینی. هەرچەند من دوور نەبووم لە حاڵو ئەوزاعی ئەودەمەی کوردستان و مهاباد, بەڵام کە ئاغا پرسیاری کردم! خۆم بەناوی تەواوی بنەماڵەوە پێ موعەرەفی نەکرد, تەنها عەرزم کردن کە خەڵکی (جوانڕۆ)م. زۆری پێنەچوو ئاغای رەئوفی زیائی حازری مەجلیسەکە بوو, خولاسە وازیان لێ نەهێنام تا بە تەواوی خۆی و ئاغای قازی ناسیمیان...

مەسەلەی پەیوەندیم لەگەڵ ئەوزاتانە و وەزعی کوردستانی ئێران و (ژ.ك) دوورو درێژە. ئەگەر خوا یاری بدات لە فرسەتێکدا بۆتان باس دەکەم...))

مامۆستا سەید تاهیری هاشمی ساڵی 1332ی کۆچی, لە دێی (دەوڵەت ئاوا)ی سەر بە پارێزگای کرماشان هاتۆتە دونیاوە. ئەو کوڕی سەید قەیداری ناسراو بە (سید الدولە)ی کوڕی سەید عەبدولقادری سۆڵەیی, کوڕی سەید رەسوڵی

سۆڵەییە. دایکی (ئەختەر خانم)ی کچی فەتاح بەگی (سەرداری ئەکرەم)ە لە بەگزادەکانی وەلەد بەگی جوانڕۆیە.

مامۆستا هاشمی لە شێخەکانی سۆڵەی قەرەداغی کوردستانی عیراقە، لە ساڵانی 1824-1825دا، بەشێك لە سۆڵەییەکانی قەرەداغ، بەسەرپەرشتی سەید رەسوڵی کوردستانی عیراقیان بەجێ هێشتووە لە ئەنجامی تێکچوونی باری سیاسی و لاوازبوون و نەمانی دەسەڵاتی میرنشینی بابانەکان. وەکو مامۆستا خۆی لە پێشەکی دیوانەکەی بەناوی (هەوارگەی دڵان)دا باسی دەکات و لەنێوان جوانڕۆو مایدەشتدا، لە دێی دەوڵەت ئاوا نیشتەجێ بوون.

بنەماڵەی (سۆڵەییەکان) لەودیو بە شۆرەتی (هاشمی) ناسراون.

مامۆستا سەید تاهیری هاشمی، لە کۆتایی بەهاری 1991دا، لە کرماشان کۆچی دوای کردووە و لە مەراسیمێکی شایستەدا، بە بەشداریی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کرماشان و پیاوە ئاینییەکان و رۆشنبیران و دەسگاکانی دەوڵەتەوە، بەرێ خرا و لەگوندی دەوڵەت ئاوا بە خاك سپێردرا.

دوو کوڕ و کچێکی لێ بەجێ ماوە. کاك حەسەنی هاشمی کوڕی بچووکی خاڵە سەید لاوێکی ڕۆشنبیرو ئەدەب دۆستە و زۆربەی کتێب و دەسنووسەکانی خوالێخۆشبوو لای ئەو



پارێزراوەو دەسنووسی ئەم کتێبەش لە کاك حەسەنەوە وەرگیراوە.

ئەم کتێبەی مامۆستا هاشمی کە لەبەر دەستدایە، بە زمانی فارسی نووسیوە. پێ دەچێت مەبەستی ئەوە بوبێت زۆرترین ژمارەی خوێنەرانی ئێرانی بیخوێننەوە، چونکە کاتی نووسینی کتێبەکە خوێنەری ئێرانی کوردی زان بە رۆشنبیرانی کوردستانی ئێرانیشەوە زۆر نەبوون وەکو ئیمڕۆ. بە قەولی خاڵە سەید تاهیر خۆی:

((بۆ بەکوردی نووسینی یان گۆڕینی بابەتەکە بۆ زمانی کوردی ئەگەر تەمەن یاری بدات خۆم دەینووسمەوە، یان کەسێکی ئەهلی غیرەت پەیدادەبێ و دەیگۆڕێ بۆ زمانی کوردی.))

لە لایەکی کەوە مامۆستا پێی وابوو زۆری رۆشنبیرانی کورد ئاگادارن مەولانا خالید کێ بووە؟ و چەند بە تواناو پلەیەکی زانستی و مەعنەوی بەرزی هەبووە. بەلام غەیری کورد ئەو راستییانە نازانن، لەبەر ئەوە بە باشی زانیوە، بە فارسی بابەتەکەی بنووسێت.

ئەو سەردەمەی مامۆستا لە کتێبەکەیدا باسی دەکات. نووسین و خوێندنەوەو ئاخاوتن بە زمانی فارسی باو بووە. ئەگەرچی کوردستانی عیراق، بۆ ماوەیەکی زۆر لەلایەن تورکە عوسمانییەکانەوە فەرمانڕەوایی کراوە، بەڵام نووسین و

خوێندنــەوە بــە تــورکی لای ڕۆشــنبیرانی کــوردی ئــەو دەمــەدا، ڕەواجی نەبووە.

مامۆستا هاشمی بە زەرافەتو وردەکارییەکی وەستایانەوە، لە بارەی ژیانو کەسایەتیو پلەو پایەی بەرزی زانستی و ئەدەبی و مەعنــەویو ویلایــەتی مــەولانا خالیــدەوە دوواوە. بەهــەمان شێوەش لە ناساندن و باس کردنی کەسایەتی و پلەی عیلمی و لایەنی تەسەوف و مەعنەویاتی شێخانی نەقشبەندی هەورامان درێغی نەکردووە. ئەو رای تایبەتی خۆی هەیە، سەبارەت بە سەرچاوەی تەریقەتی نەقشبەندی، بەپێچەوانەی راو بۆچوونی باو. ئەو سەرچاوەکە دەگێڕێتەوە بۆ (ئیمامی عەلی) خوای لێ ڕازی بێت.

ماوەتەوە دەست خۆشی بکەم لە برای وەرگێڕ کاك دلێر میرزا، بۆ ئەم کارە باشەی ئەنجامی داوە. ئومێد دەکەم درێژە بدات بە هەوڵەکانی. هەروا دەستخۆشی دەکەم لە بەڕێوەبەرێتیی خانەی وەرگێڕان سەربە وەزارەتی ڕۆشنبیری، بۆ هەڵبژاردنی بابەتەکەو بەچاپ گەیاندنی، هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم لە خزمەت کردنی ڕۆشنبیری کوردیدا.



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

**شاکەلی**

2002/8/12

## ماوەیەك لە خزمەتی تاهیری هاشمیدا..

پێش ئەوەی بچمە سەرباسی خوا لێخۆشبوو سەید تاهیری هاشمی، بە کورتی باسێکی گوندی دەوڵەت ئاوا بە پێویست دەزانم بۆ ئەوەی خوێنەران هەندێ شارەزاییان هەبێ لەسەر ئەو گوندە کە شوێنی نیشتەجێبوونی تاهیری هاشمی بوو لە زۆربەی ڕۆژگاری ژیانیدا.

دەوڵەتاوا گوندێکە کەوتووەتە نێوان سنووری جوانڕۆ و مایدەشت و پشتی لە شاخی شاهۆی سەرکەشە. گوندەکە بە لاپاڵی گردێکەوە دروستکراوە کە لە جوانڕۆوە درێژ دەبێتەوە بۆ مایدەشت و کۆتایی ئەو هێڵە بەرزاییانەیە, پێش ئەوەی سنووری مایدەشت دەست پێبکا. ئەم گوندە وەك گوتمان پشتی کردووەتە شاهۆ و جوانڕۆ کەوتووەتە لای ڕاستیو دەشتی مایدەشت کەوتووەتە لای چەپی.

وەك بیستوومە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا شێخ ڕەسووڵی باپیرەی تاهیر هاشمی لە سۆڵەی کوردستانی عیراقەوە ڕووی کردوەتە ئەو ناوچەیە بە مەبەستی ئیرشادو ڕێنمایی کردنی خەڵك و لە لایەن قاجارییەکانی فەرمانڕەوای ئەوسەردەمەی ئێرانەوە, ڕێزی لێگیراوەو نازناوی (سید الدولة) ی پێ بەخشراوە و لە ناو خەڵك و دەوروبەردا ناوبانگێکی تەواوی پەیدا کردووە, وەك ڕابەرێکی تەریقەی قادری, تا ئەو کاتەی لە دونیا دەرچووە, ئێستا ئارامگاکەی لەسەر گردەکەی پشتی دەوڵەتە تاواوەیەو وەك ڕابەرێکی ئەو ڕێبازە زۆر کەس سەردانی دەکەن.

تاهیر هاشمی کوڕی سەید قەیداری کوڕی شێخ ڕەسووڵە, سێ برای تری هەبوو بەناوی سەید عەلی, سەید وجیهالدین, شێخ قادر کە برابچووکیان بوو, شێخ تاهیر پیاوێکی بالابەرزو



کەڵەگەت, سووروسپیو مووزەرد و پرچێکی لوول و جوان تا سەرشانەکانی شۆڕ بووبووەوە.

بەڕاستی نووسین لەسەر تاهیر هاشمی توانایەکی تەواوی دەوێ, من خۆم دان بەوەدا دەنێم کە ئەو توانایەم نییە بتوانم ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنم, مرۆڤێکی تەواو خوێندەوار, شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە زمانی فارسی و عەرەبیو کوردیدا, خۆشنووسێکی وابوو کە لام وایە ئەگەر لە وڵاتێکی ئاوەداندا بووایە لە ڕیزی پێشەوەی خۆشنووساندا دائەنرا, پیاوێکی ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین, هەموو کاتێك هەرخەریکی خوێندنەوەی کتێب و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە بوو کە لە تاران لە سەردەمی شادا بڵاو ئەکرانەوە.

پیاوێکی دڵ فەرەح و فراوان, تەکیەکەی شوێن حەوانەوەی ڕێبواران بوو, یەکەم جار کە ڕێم کەوتە ئەوێ لای ئێوارە برسیم بوو هەرچاوەڕێی نانخواردنم ئەکرد هیچ دیارنەبوو, درەنگ وەختانێك لە یەکێك لە خزمەتگوزارەکانم پرسی: ئەرێ ئێوە ئێواران نان ناخۆن؟, وتی: چۆن ناخۆین, وتم جا کەی؟ وتی لێرە تا ئەو کاتەی کە ئیتر بەتەما نەبین ڕێبوارێك بگاتە ئێرە نابێ نان بخۆین, چونکە ئەو میوانەی کە درەنگ ئەگاتە جێ جوان نییە پاشماوە بخوات.

شێخ تاهی وادیارە لەسەردەمی ڕەزا شای گەورەدا ماوەیەك لە دەوڵەتاوا دوورکەوتووەتەوەو بووە بە فەرمانبەر لە کرماشان,

دوور نییە لەبەر ئەوە بووبیٚ لە گێچەڵی ڕەزا شاخۆی دوورخستبێتەوە, چونکە رەزا شا لەو سەردەمەدا چی خاوەن موڵك بووە هەمووی ڕاپێچ کردوون بۆ زیندانەکانی تاران, ئەمانیش چوار گوندیان هەبوو, سەید عەلی برا گەورەیان بەر ئەو شاڵاوە کەوتبوو و گیرابوو, تا ئەو کاتەی ئێران داگیر کرا لە لایەن سوپای ڕووس و ئینگلیزەوە و ڕەزا شا وڵات بەدەر کرا, سەیید عەلی هەر لە زینداندا مابوویەوە پشتی چەمی بووەوە.

شێخ تاهیر مرۆڤێکی کورد پەروەر بوو, حەزی لە گەشەکردنی ئەدیبات و زمانی کوردی بوو, لە ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژدا زۆر جار شیعر ونووسینی بڵاو دەکردەوە. پەیوەندییەکی توند و تۆڵی هەبوو لەگەڵ بزووتنەوەی کۆماری مەهاباد دا, سەیید موحەمەدی برای مامۆستا مەلا زاهیدی ئیمامی مزگەوتی سوننەکانی کرماشان, لە و سەردەمەدا وەك نوێنەرێکی کۆماری مەهاباد هەموو جارێك چی گۆڤارو رۆژنامە هەبوو دەیهێنا بۆ دەوڵەتاوا و تەنانەت ئەوەم لە یادە کە یەکەمجار لە ژوورێکی پەنادا شێخ تاهیرو مامۆستا مەلا مەجید و چەند کەسێکی تر لەگەڵ نوێنەری کۆماردا کۆبوونەوە و سوێندیان خوارد بە قورئان کە خیانەت نەکەن لەو کۆمارەو نهێنییەکانی بپارێزن.

پاش لەوناوبردنی کۆماری مەهاباد و داگیرکردنەوەی ناوچەکە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە, جوانڕۆ هێشتا مابوویەوەو سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو, دەوڵەتی ئێران دەستی کرد بە





کۆکردنەوەی سوپاو کوردی خۆفرۆشی ناوچەکە بۆ داگیرکردنەوەی جوانڕۆ, سوپایەکی زۆری هێنایە دەوڵەتاوا و شێخەکانی ناچار کرد خانووەکانیان چۆڵ کرد بۆ سەربازو کاربەدەستە سوپاییەکان. پێش دەستکردن بە هێرشەکە, وەفدێکیان نارد بۆ لای جوانڕۆییەکان بۆ ئەوەی بەبیٚ شەڕکردن خۆیان بدەن بە دەستەوە. شێخ تاهیرو چەند کەسێکی تر ئەندامی وەفدەکە بوون کە چوون بۆ قەڵای جوانڕۆ بۆ لای وەکیلەکانی جوانڕۆ, بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون بۆ خۆبەدەستەوەدان و سوور بوون لەسەر بەرەنگار بوونەوەی هێرشەکە.

وەك لەسەرەوە باسم کرد, باسکردن لەسەر ژیانی تاهیر هاشمی پێویستی بە توانابییەکی تەواو و شارەزاییەکی باش هەیە. لێرەدا ئیتر کۆتایی بەم چەند دێڕە دەهێنم.

**حەسەن عەبدولکەریم**

2002/10/1



**بسم الله الرحمن الرحيم**

**سبحانك لاعلم لنا الا ماعلمتنا انك انت العليم الحكيم,**

**اللهم صل على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم .**

تەریقەتی نەقشبەندی دەگەڕێتەوە بۆ خواجە بەهادین محەمەدی کوڕی بوخاری کەیەکێکە لە عارفو سۆفییە گەورەکانی سەدەی شەشەم و دامەزرێنەری ئەم تەریقەتەیە . (خواجە عەلائوددین عەتتار)[1] و (خواجە محەممەد پارسا)[2] هەردووکیان موریدی بوخارین . کتێبی(دلیل العاشقین ) لەسەر سۆفیگەری و کتێبی ژیاننامەی لەسەر ئامۆژگاری نووسیوە . لەساڵی 791 یان 790 ی کۆچی, لە زێدی خۆی لە قەسری عارفانی سەربە بوخارا, کۆچی دوایی کردووە . ناوی قەسری عارفان بەر لەدایکبوونی خواجە بهائوددین, قەسری هیندوان بوو, فەرسەخێك لە شاری بوخاراوە دوور بووە .

## ناوو مێژووی بوخارا

1 . خواجە عەلائودین محەممەد کوڕی محەممەدی بوخاری, جێنشینی خواجەی نەقشبەندو ڕێبەری زانا سەید شەریفی جرجانییە . دوای نوێژی شێوانی رۆژی چوارشەممە, ڕێکەوتی (20)ی رەجەبی ساڵی 802 کۆچی, کۆچی دوایی کردووە .

2 . محەممەد کوری محەممەد کوڕی مەحمودی حافیزی بوخاری, یەکێکە لەزانا گەورەکان, لەرۆژی پێنچشەممە 24ی (ذی الحجة) ی ساڵی 822ی کۆچی, لەشاری (مدینە)کۆچی دوایی کردووەو مەولانا شەمسوددینی فەنناری زانای ناوداری رۆم,نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی خوێندووە .





بوخارا شارێکی ناوداره دەکەوێتە ئەودیو رووباری ئامۆن (ماوراء النهر)ەوە, ولەبوخارەوە وەرگیراوە, بەمانای زانستی فراوان, چونکە ئەو شارە زاناو هونەرمەندی زۆری تێدا هەڵکەوتووە, بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە . هەندێ دەڵێن بوخار بەمانای زانست نییە . لەو سەردەمانەدا , هێندە شارێکی مەزن بووە کە لەوێنەی کەم بووەو بە بوخارای پیرۆز ناویان بردووە (11) دەروازەو (200) قوتابخانەی گەورەو بچووكو(7)مزگەوتو (40) گەرماوو (150)دوکانی بازرگانی تێدایبووە, پانتایی قەڵای بوخارا (1)فەرسەخەو روو لەڕۆژئاوایە . دەوران دەوری پەرژینی بوخارا بە (1372)پێ خەملێنراوە .

دووریی بوخارا لە سەمەرقەندەوە (38) فەرسەخەو سەمەرقەند هەندێ لە بوخارا بچووکترە . لەکەناری رووباری زەرئەفشان کە هەر لە دێر زەمانەوە هەواری ئێرانییەکان بووە, ئەوزاراوە مەغۆلییە لە رەچەڵەکدا ناوێکی ئێرانی بووە. ویهار یان بەهار, وەکو نەوبەهار ناوی پەرستگەی زەردەشتییەکان بووە, زاراوەی بوخارا لە زاراوەی بت پەرستانی ئیغۆرو خەتایەوە نزیکە کەئەوانیش بە پەرستگەی بتەکانیان دەڵێن بوخاراو, بوخارا لە بوخارەوە وەرگیراوە کە بەزمانی موغان بەمانای زانستگەیە .

ناوچەیەکی شێدارەو میوەجاتی زۆرەو گەلێ ئاودارەو دانیشتوانی جەنگاوەرو هەڵمەت بەرنو فەرشو بەرەو بەرماڵی بەناوبانگە . بوخارا رووبەری 72×72 کیلۆمەترە, بە دیوارێك چوار دەور گیراوە کە هەموو کاروانسەراو گوندەکانی دەوروبەریشی, دەکەونە ناو ئەو دیوارەوەو دوو رووباری خەرنابو جەیحون لەخۆ دەگرێتو ئەم قەڵەمڕەوە, تا

سنووری بەدەخشان دەگات . بوخارا چەند ناوێکی تری هەبووە وەك :
نیمجکت، بومسکت، مدینة الصفریة، مدینة التجار .

یاقوت لە (معجم البلدان) دا دەڵێت: بوخارا گەورەترین شاری ئەو دیو رووباری ئامۆنە . مەودای نێوان بوخاراو جەیحون دوورۆژ ڕێگایە، پایتەختی سامانییەکان بوو. بەتلیمۆس لە کتێبی (ملحمە)دا دەڵێت: درێژییەکەی 87 پلەو پانتاییەکەی 41 پلەیەو لەهەرێمی پێنجەمدایەو بورجەکەشی شێرە .

شارێکی دێرینەوباخ و باخاتی میوەی فراوانەو بەروبوومەکەی ڕەوانەی (مەرو)دەکرێت . لە بوخاراوە مەرو (13) ڕۆژ ڕێیە و مەودای نێوان بوخاراو خەوارزم زیاتر لە (15) ڕۆژ ڕێیەو تا سەمەرقەند (7) ڕۆژ، واتە(379) فەرسەخە (هەر فەرسەخێك نزیکەی 6 کیلۆمەترە) . لەسەر قەڵا کۆنە (قهندز)ەکەی بوخاراوە، تاچاو بڕەدەکات، سەوز دەکاتەوەو باخی میوەیە کە کۆشك و تەلارەکانیان لە ئامێز گرتووەو سەوزیی باخەکان ئاوێتەی شینایی ئاسمان بوون . بە(بومجکت) یش ناوبراوە . قەڵای قەهەندز شوێنی نیشتەجێبوونی میرە سامانییەکان بووەو ، خانووەکان و مزگەوتیش نزیکی دەروازەی قەهەندزەو رووباری سەغد بەناو خانووەکاندا دەڕوات .

بوخارا شارێکە لە تورکەمنستانی سەر بەکۆماری ئۆزبەکستانی یەکێتی سۆڤیەت، هاوسنووری زەرئەفشانەو دانیشتوانەکەی نزیکەی (80)هەزار کەسە . نزیکی بیابانی قزل قومە . ئێستا لە دووبەش پێکهاتووە : بوخارای نوێ کەشارێکی روسییەو ویستگەی شەمەندەفەری تۆرکستانە . بەشە کۆنەکەی بوخارا کەبەباخی چڕ دەوری گیراوەو چەندین مزگەوتی کۆنی تێدایەو ڕێگەی





مەرووسەمەرقەندو مەشهەدو هەرات بەو شارەدا ڕەتدەبێت و لەڕووی بازرگانییەوە، بایەخێکی زۆری هەیە . بەروبوومی سەرەکی، بریتییە لە ئاورێشم و لۆکەو کانزای مسی هەیە . لەسەرەتادا ئەم شارە، پایتەختی سامانییەکان بوو. جەنگیز خان داگیرو وێرانی کردو دوای دووبارە ئاوەدان کردنەوەی، ساڵانێکی زۆر بوو بەپایتەختی ئۆزبەکییەکان و دواتریش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئێرانەوەو لەسەردەمی قاجارییەکاندا، روسەکان داگیریان کرد . بوخارا کەوتۆتە رۆژهەڵاتی مەرو، بەرزییەکەی 366مەترە لەسەر رووی دەریاوە . قوتابخانەی عەبدوڵڵاو کۆشکی خان، دوو بینای کۆنی ئەو شارەن . دانیشتوانەکەی تاجیك و فارسی زمانن و تورك و یەهودیشی تێدایە . پێستی مەڕی ئەو ناوچەیە ناودارەو لەپێستی جۆرە مەڕێکی تر کە خورییەکەی لولە، کڵاوی نایاب دەچنن . ئەم ناوچەیە حوشتری زۆرەو لە مووەکەی عەبا دەچنن . هەرێمی بوخارا پێك هاتووە لە: ئورامتیانی زیندانی، وافکەند، وردانزی، حەیز ئاباد، واکانزی، کیجوان، کرمینە، زودین، کاتکرکان، قەتارچی، پێنجشەممە، میتان، توراتە، چالاق، کرشی، خوزار، شیرئاباد، سەدئاباد، چراغچی، ناراز، کاکی، چارجوی و ئوتار .

بوخارا شارێکی بەناوبانگی ئەودیو رووباری ئامۆنە کە ئەوسا بارەگای خانی بوخارا بووەو ئێستا یەکێکە لە شارەکانی ئۆزبەکستان و دانیشتوانی (80) هەزار کەسەو ئەو هەرێمەی کە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خان بە (کەنارا)یش ناودەبراو دەڵێن لەبەر ئەوەی ئەم شارە، زاناو هزرمەندی زۆی تێدا بووە ، بۆیە بوخارایان پێ گوتووەو بوخار بەمانای زانستە . دەڤەری بوخارا کەوتۆتە

باشووری رۆژهەڵاتی تورکستانەوە , لەنێوان 35 پلەو 15 خولەكو 41 چرکە پانتایی باکوورو 60 پلەو 70 خولەكو 40چرکە درێژایی رۆژهەڵاتەوە کەبریتیبوو لە خانەکانی بوخاراو ئانکویی و کەندوزو حەسارو ...هتد ورووبەرەکەی 593000 کیلۆمەتر دووجایەو پایتەختەکەشی بوخارایەو سەمەرقەندو قراتۆل دووشاری گەورەی ئەو هەرێمەن . ئەم دەڤەرە لەسەردەمی کیانەکاندا, یەکێك بووە لە دەڤەرە پانو بەرینەکانی ئێرانو دواتر ئەسکەندەر داگیری کردووەو پاشان بەشێك بووە لە مەمەلەکەتی باختەرەکانو لە سەدەی شەشەمی زایینیدا, تورکەکان دەستیان بەسەرداگرتووەو, لەسەدەی حەوتەمدا چینییەکان داگیریان کردووەو, لەساڵی 705ی زایینییدا, لەلایەن عەرەبەکانەوە داگیرکراوە و تاسەدەی نۆیەم لە ژێر دەسەڵاتی جێنیشینandا بووەو لە ساڵی 1000ی زایینییدا, سامانییەکان دەستیان بەسەردا گرتووەو لە ساڵی 1127دا, سەلجوقییەکانو لە ساڵی 1319 مەغۆلەکانو لەساڵی 1383 ئەمیر تەیمورو لە ساڵی 1505 ئۆزبەکییەکان تاوەکو لە ساڵی 1600ی زایینییدا, ئەستراخان دەستی بەسەردا گرتو دوای خۆی کورو کوڕەزاکانی کەبەرەچەڵەك ئۆزبەك بوون بەرواڵەت بەڕێوەیان دەبرد, بەڵام لە راستیدا بەبەشێك لە قەڵەمرەوی روس دادەنرا . دەڵێن کە بیدوبوخارخودا کۆچی دوایی کرد, کۆرپەیەکی شیرەخۆرەی لەپاش بەجێ ما, ناوی توفسا دەبوو, دایکی ئەم منداڵە(15) ساڵ حوکمڕانی کردو لەسەردەمی ئەودابوو کە عەرەبەکان بوخارایان داگیر کرد .





## بنەماکانی تەریقەتی نەقشبەندی

نووسەری کتێبی (رشحات عین الحیاة) , بنەماکانی تەریقەتی نەقشبەندی , کە بە تەریقەتی خواجەگانیش ناودەبرێت , بەم جۆرە باس دەکات :

1-هۆشی هەنووکەیی : ئەوەیە کەهەر هەناسەیەك بەرەو دەرەوە بێت, دەبێ لەرووی ئاگاییەوە بێتو غافڵبوون زەفەری پێ نەبات .

2-سەربەرزکردنەوە : ئەوەیە کە لەهاتو چۆدا, تەماشای بەرپێی خۆی بکات, تاوەکو دیدو روانینی پەرشو بڵاونەبێتەوەو چاوی بەشوێنی نابەجێ نەکەوێت .

3-گەشت لە نیشتمان: ئەوەیە کەلە سروشتی بەشەردا گەشت بکات, واتە لە ئاکاری بەشەرییەوە بۆ ئاکاری پەریو لە ئاکاری ناپەسەندەوە بۆ ئاکاری پەسەند هەنگاو بنێت .

4-تەنیایی لەناو کۆڕدا : وەکو خواجە بەهائوددین دەڵێت, واتە بەرواڵەت لەگەڵ کۆڕو بەناوەرۆك لەگەڵ خودا . وئەوەی خوداوەند فەرموویەتی :((رجال لا تلهیهم تجارة ولا بیع عن ذكر الله )) ئاماژە کردنە بەو پێگەیە .

5-یادکردن: بریتییە لەیادی زارەکی یان بەدڵ . مەولانا سەعدەدینی کاشفەری فەرموویەتی کەرێگەی فێرکردن

لەیادکردنیدایە, کە یەکەم جار شێخ بەدڵ بڵێت : لاالە الا اللە محمد رسول اللە و مورید دڵی خۆی ئامادە بکاتو لەبەرامبەر دڵی شێخ دابنێتو چاوبکاتەوەو دەمی نەجوڵێنێتو زمانی بەمەلاشوویەوە بچەسپێنێتو ددانەکانی لەسەر یەکتر دابنێتو هەناسە نەداتو بەهەموو هێزیەوە, دەست بکات بەدەستەبەر کردنی رەزامەندیی شێخ, وبەدڵ بڵێت نەک بەزمان . ولەهەناسەداندا ئۆقرە بگرێتو لەیەک هەناسەدا, سێجار بیڵێتەوە, تاوەکو چێژی بەدڵ بکات . وشێوازێک کە پارێزگاری کردنی ئاسانتر بێت ئەوەیە کە هەناسە لە ژێر ناوکدا پەنگ بخواتو لێو لەسەر لێووزمان بە مەلاشوەوە بچەسپێت, بەجۆرێ کەهەناسە لە دەروونـدا, لەرادەبەدەر سەغڵەت نەکاتو راستی دڵ لەهەموو بیرکردنەوەیەک بێزار بکات, سەرنجی بۆ پارچە گۆشتێکی وەکو درەختی سنۆبەر رابکێشێتو سەرقاڵی زیکری بکات بەم جۆرە کە وشەی (لا) لەسەررووی ناوەکەوە بەرەو سەرتر هەڵکشێتو وشەی (اله) بەرەو دەستی راست بڕوات وشەی (الاالله) بەتوندی بەسەردڵی سنۆبەرەکەدا بکوتێت, بەجۆرێ کە گەرمایی بە تێکڕایی ئەندامەکانی بگات .

6-گەڕانەوە : ئەوە کەهەر جارێ بەیاد هێنەر ئەو وشانەی بەدەمدا هات, دوا بەدوای بەهەمان شێوە بڵێت کە خودایا مەبەستی من تەنها تۆو رەزامەندیی تۆیە . چونکە ئەم وشەی گەڕانەوەیە, رەتکەرەوەیە . هەر یادکردنێک چ باش و چ خراپ, تاوەکو یادی ئەو بەپاکی بمێنێتەوەو رازی ئەو بۆ کەسانی تر شاراوە بێت .

7-پارێزگاری : بریتییە لە پارێزگاری کردنی یاد . بەوەی لە ساتێکدا چەند جار وشەکە دووبارە بکاتەوە, تاوەکو بیرو هۆشی بۆ



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

لایەکی تر نەچێت . ومەولانا سەعدودین سەبارەت بە مانای ئەم وشەیە فەرموویەتی, دەبێ یەک سەعاتو دووسەعاتو زیاتریش بە پێی بواری رەخساوو چاودێریی لە بیری خۆی بکات, تاوەکو یادو بیری دیکە سەر هەڵنەدەن .

8-یاداشت : کە مەبەست لەم شتانە ئەوەیە کە وتنی وشەکان لە رووی ئاگایی تەواو لەخوداوەیە, لە سۆنگەی حەزو ئارەزووەوە, و ئامادەبوونی بێئامادە نەبوونو زاڵبوونی, شایەتی حەقیشی پێ دەگوترێت .

## زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی

دواتر ودوای کۆچی دوایی خواجە بەهائوددینی نەقشبەند, زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی تۆمار کراوە, تا دەگاتەوە سەر حەزرەتی ئەبو بەکری سدیق(ر). بەپێی ئەم زنجیرەیە, شێخ ئەبو عەلی فارمەدی, موریدی شێخ ئەبولحەسەنی خەرەقانییەو ئەویش موریدی شێخ بایەزیدی بەستامیو ئەویش موریدی حەزرەتی ئیمام جەعفەری سادیقەو ئیمامیش موریدی ئیمام قاسمی کوڕی محەمەدوئەویش موریدی سەلمانی فارسیو سەلمانیش موریدی حەزرەتی ئەبو بەکری سدیقە .

ئەگەر دەمار گیریو زویری لێنەکەوێتەوە, ئەم زنجیرەیە زنجیرەیەکی بەرودوو لێکدانەبڕاو نییە, چونکە سەرەڕای ئەوەی خواجە بەهائوددینی نەقشبەند زنجیرەی تەریقەتەکەی خۆی رانەگەیاندووەو لە وەلامی پرسیارێکدا دەڵێت : لە زنجیرەوە کەس بەشوێنێك ناگات .

**یەکەم**, گفتو گۆی شێخ ئەبو عەلی فەزڵی کوڕی محەمەدی فارمەدی(403-477) کۆچی, خەڵکی توس, لەگەڵ شێخ ئەبولحەسەن عەلی کوڕی جەعفەر, یان عەلی کوڕی ئەحمەدی خەرەقانی (348-

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

425کۆچی) لە دایك بووی خەرەقانی بەستام, وەکو موریدو موراد جێگەی گومانە . چونکە لەکاتی کۆچی دوایی شێخ ئەبولحەسەنی خەرەقانیدا, گەنجێکی (23)ساڵەبووەو لەوکاتەدا لەنەیشاپوور سەرقاڵی خوێندن بووەو , هیچ بایەخێکی بەجیهانی سۆفیگەری نەداوە . بەپێی وتەی نووسەری کتێبی (اسرار التوحید في مقامات الشیخ ابي سعید), شێخ ئەبو عەلی فارمەدی یەکێکە لەو (40) کەسەی کە بەهۆی ویستی شێخ ئەبو سەعیدی کوری ئەبولخەیری میهەنی, بەپلەی وەلی گەیشتووە . کاتێ کەشێخ ئەبو عەلی فارمەدی لە نەیشاپور سەرقاڵی خوێندن بووە, بەدیداری شێخ ئەبو سەعید فەزڵوڵلا کوڕی ئەبولخەیر محەمەدی میهەنی ( کە لە مانگی موحەرەمی ساڵی 357ی کۆچی لە میهنە لە دایك بووەو لە شەعبانی ساڵی 440ی کۆچی لە بوخارا, کۆچی دوایی کردووە ) شاد بوو. دوای تەواو کردنی خوێندن , لە خزمەتی ئیمام ئەبولقاسم عەبدولکەریمی کوڕی هوازنی قوشەیری, (376-465 کۆچی) خەڵکی نەیشاپوورو نووسەری کتێبی (معروف الرسالة) چووە ناو سەیرو سلوکەوە, ولەبەر ئەوەی لە چوار چێوەی تەسەروفی ئیمامدا گەشەی کردو دوای وەرگرتنی مۆڵەت چووە خزمەتی شێخ ئەبو القاسم عەلی گورگانی توسی, دۆستو هاوچەرخی شێخ ئەبو سەعید ئەبولخەیرو تادوا رۆژی ژیانی شێخ, لە خزمەتیدا بوو, شێخ ئەبو القاسم بڕوانامەی پێبەخشیو کچی خۆی لێ مارە بڕیو بەجێنشینی خۆی کرد . شێخ ئەبولحەسەن عەلی هەجویری غەزنەوی کە بەدیداری شێخ ئەبولقاسمی گورگانی شادببوو, لە کتێبی (کشف المحجوب)دا , ئاماژەی پێدەکات . سەبارەت بەوەی کە شێخ ئەبوعەلی فارمەدی بە شایستەی جێنشینی

شـێخ ئـەبولقاسمی گورگـانی دەزانێـت, کـاتێ کەشـێخ ئەبوعـەلی فارمەدیو شێخ ئەبو بەکری نەسساج , لە خزمەتی شێخ ئەبو لقاسمی گورگانیدا, سەرقاڵی سلوكو کۆشش بوون, شێخ هەردووکیانی بۆ خزمەتی شێخ ئەبوسەعیدئەبولخەیر لە میهنە رەوانە کرد, تاوەکو(40) رۆژ لە خانەقاکەیدا خزمەت بکەن . شێخ ئەبو سەعید شێخ ئەبو عەلی فارمەدی ڕاسپارد, تاوەکو دەرو دیواری خانەقا پاك بکاتەوەو, شێخ ئەبو بەکری نەساجیشی راسپارد تاکاری کەوشداریی دەروێشەکان لە ئەستۆ بگرێت. جگە لەوەی کە ئیمام حوجەتولئیسلام غەزالی کەموریدی شێخ ئەبو عەلی فارمەدی بووە, بەراشکاوی شێخ ئەبو لقاسمی گورگانی بەپیرو مامۆستاو شێخی ئەبو عەلی فارمەدی لە قەڵەم دەدات .

**دووەم** : هاوچەرخ بوونی شێخ ئەبولحەسەنی خەرەقانیو شێخ بایەزیدی بەستامی( 188-261 یان 234) کارێکی مەحاڵە, بەپێی شیمانەی یەکەم 87 ساڵو بەپێی شیمانەی دووەم 114 ساڵ, دەکەوێتە نێوان کۆچی دوایی بایەزیدو لەدایکبوونی ئەبولحەسەندا .

**سێهەم**:قاسمی کوڕی محەمەدی کوری ئەبوبەکر لەساڵی 37 کۆچی لەمەدینە هاتۆتە دنیاوەو لەساڵی 107 لەهەمان شوێندا کۆچی دوایی کردووەو, سەلمانی فارسی لەساڵی 35 یان 36ی کۆچی , واتە یەك یان دووساڵ بەر لەدایکبوونی قاسمی کوڕی محەمەد , لە مەداین کۆچی دوایی کردووە .





**چوارەم** : پەیوەندی ووابەستەیی تایبەتی سەلمانی فارسی بە عەلیو بەخانەوادەی پەیامبەر ( دروودی خوای لێبێت) داستانێکە لەکەس شاراوە نییە .

بەپێی ئەم بەڵگە مێژوویی و حاشا هەڵنەگرانە, زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی, هەمان زنجیرەی شێخ ئەبو عەلی فارمەدی – شێخ ئەبو القاسمی گورگانییە کەدەچێتەوە سەر حەزرەتی عەلی . وتەنیا ئەم بۆچوونە راستە. زنجیرەی شێخ ئەبوعەلی فارمەدی, بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

| ئەمیری موسوڵمانان عەلی درووودو رەزای خوای لەسەر بێت | |
|---|---|
| سەروەری شەهیدان حوسێن<br>ئیمام زەینولعابدین | شێخ حەسەنی بەسری |
| ئیمام محەممەدی باقر<br>ئیمام جەعفەری سادق | شێخ حەبیبی عەجەمی |
| ئیمام موسای کازم<br>ئیمام عەلی ڕەزا | شێخ داودی تائی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەبو محەمەدی جورەیری | شێخ ئەبو بەکری شبلی | شێخ ئەبو محەمەدی مورتەعیش | شێخ ئەبو عەلی رودباری | شێخ ئەبو بەکری شبلی |
| عەبدوڵڵای تەبەری | شێخ ئەبو القاسم نەسر ئابادی | شێخ ئەبو نەسری سەرراج | شێخ ئەبو عەلی کاتب | شێخ ئەبو قاسمی نەسر ئابادی |
| ئەبولعەباسی قەساب | شێخ ئەبو عەبولرەحمانی سەلما | پیر ئەبو لفەزلی حەسەن | شێخ ئەبو عوسمانی مەغربی | شیخ ئەبو عەلی دەقاق |
| | | | شێخ ئەبوقاسمی گورگان | شێخ ئەبولقاسمی قوشەیری |

| |
|---|
| شێخ ئەبو سەعیدی کوڕی ئەبولخەیر |
| شێخ ئەبو عەلی فارمەدی |
| شێخ یوسفی هەمەدانی |
| خواجە عەبدولخالقی غەجدوانی |
| مەولانا عارفی ریوگەری |
| خواجە مەحمود ئەنجیری فەغنەوی |
| خواجە عەلی دامیتنی |
| خواجە محەمەدی باباسەماسی |





| |
|---|
| سەید ئەمیری کەلالی بوخاری |
| خواجە بەهائودینی نەقشبەند |
| شێخ مەعروفی کەرخی |
| شێخ سەریی سەقتی |
| شێخ جونەیدی بەغدادی |

گومانی تێدانییە, بەر لە پەیدابوونی مەولاناخالید, لە کوردستاندا , تەریقەتی نەقشبەندی لایەنگران و هەوادارانی خۆی هەبووە . بەڵام دەبێ تەشەنە کردن و گشتاندنی ئەم تەریقەتە لە کوردستاندا , هاوکات لەگەڵ وەرچەرخانی باری مەولانا خالید لەوانە وتنەوەو فەتواوە بۆ شێخایەتی و ئیرشاد دیاری بکرێت .

لەسەدەی حەوتەم تاسەدەی دەیەمی کۆچی, تەریقەتی سوهرەوەردی لە ڕێگەی شێخ ئەبولنەجیب عەبدولقاهیرو شێخ شیهابودین عومەری سوهرەوەردی برازایەوە کە هەردووکیان لە کوردەکانی سوهرەوەردن ,وهەروەها ڕێبازی خەڵوەتی کە لقێکە لە ڕێبازی سوهرەوەردی , لە ڕێگەی شێخ عەبدولغەفاری ئەعلا باپیرە گەورەی شێخانی مەردۆخ و شێخ حەسەنی ئورامانی هاوچەرخی مەولانا ئەبو بەکری موسەنیف و دەستەیەکی دیکە لە شێخە کوردەکان, ناوچەکانی کوردستانی گرتبۆوە . لەگەڵ سەرهەڵدانی عارف و زانای بەناوبانگی کورد سەید ئیسماعیلی بەرزنجی , ناسراوە بە شێخ ئیسماعیلی ولیانی[1] , سەروەریی کەوتە دەستی تەریقەتی

[1] بەپێی هەندێ زنجیرەکانی بنەماڵەی ساداتی بەرزنجە, شێخ ئیسماعیلی ولیانی لەساڵی 1160 کۆچی, کۆچی دوایی کردووە. بەرێز شێخ محەمەدی خاڵ

قادری . ولەگەڵ دەستپێکردنی چالاکیی مەولاناخالیددا , تەریقەتی نەقشبەندیش لە رووی ژمارەی هەوادارانەوە گەشەی کرد . ئەم گەشە کردنە لە ژمارەی هەوادارانی قادری , سەبارەت بە بواری ئەدەبیش کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو . بەوەی کە ئەدەبی کاکەیی کەبەزاراوەی گۆران بوو , دانیشتوانی شارەزووریش, لەرووی لاسایی کردنەوە , ئەو زاراوەیەیان کردبوو بە زمانی شیعری خۆیان و لە ئاکامی کاریگەریی ئەوتەریقەتە ,لەشارەزووردا, رەنگو بۆی خۆی لەدەست داو ئەدەبی زاراوەی سلێمانی (زمانی شیعری نالیو کوردی) هەوێنو بنەمای زاراوەی ئێستای دانیشتوانی سلێمانی, شوێنی زاراوەی گۆرانی گرتەوە .

---

لەلاپەڕەی 87 لەکتێبی (الشيخ معروف النودهي) بەکورتی ئاماژە بەشێخ دەکات کەدقاو دەق دەینووسینەوە :

(( .. وكان الشيخ اسمعيل عالما من فطاحل العلماء, ومرشدا لامعا في الطريقة القادرية . ولد في اوائل القرن الحادي عشر الهجري وتوفي في القرية المذكورة (قازانقاية) عام 1094 هـ -1683م .

ولقد قيل في تاريخ وفاته:

امام بانوار الطريقة قدرقى — وبحر باسرار الحقيقة قد طمى

سمّي ذبيح الله ارّخت مادحا — لفقدك اسمعيل قد بكت السما

مخروف المصراع الاخير هي بحساب الجمل اربعة وتسعون بعد الف . پێویستە ئاماژە بەوەبکەین کە مەزاری شێخ ئیسماعیل لەعەقرەیەو پیتەکانی دوانیودێر دەکاتە 1104 وبەخستنەسەری مادحا, دەبێتە1158 ولەمێژووی راستەقینە نزیك دەبێتەوە .





مەخابن نووسەرانی بنەماڵەی نەقشبەندیی خالیدی , لە نووسینەکانیاندا, زیاتر بایەخیان بە وتارو مەقامنووسیی تایبەت بە سۆفیان دەداو تارادەیەکی بەرچاو, نووسینەوەی لایەنی ژیانی زانستیو کۆمەڵایەتیو عرفانی شێخە گەورەو ناودارەکانی خۆیان پشت گوێ دەخست . بۆیە لە رووی ئەم بەڵگەنامە دەسنووسو چاپکراوانەی کە ئەمرۆ لەبەر دەستدان , مەحاڵە بتوانرێت بەشێوەیەکی گشتگیر گوزارشت لەو گەورەپیاوانە بکرێت .

بەندە ئەگەرچی لە ئاستێکی زانستیو ئەدەبی ئەوتۆدانیم , بەڵام دۆستی رێزدارو خۆشەویستم حاجی شێخ ئەمینودینی نەقشبەندیی (خوا بیپارێزێت) هانی دامو بەیارمەتیو هاوکاریی دڵسۆزانی ئەم رێگەیە, دەستم دایە ئامادەکردنی ئەم پێشەکییەو هیوادارم لە چوار چێوەی ( مالا یدرك کله لایترك کله) , لەو رووەوە سەرکەوتوو بم . ئەڵبەتە بەو جۆرەی کەچەند جارێ پێم راگەیاندووە, سەبك و شێوازی دارشتنی ئەم کورتە باسە, دوورە لەشێوازی وتارو بەرجەستەکردنی کەرامات و کاری نائاسایی . پشت بەخوا, هەوڵ ئەدەم بەپێی توانا , لایەنی زانستیو کۆمەڵایەتیو عرفانی ژیانی ئەو گەورە پیاوانە ,

( رەحمەتی خودایان لێبێت) بنووسمەوەو, هیوادارم ئەم رەوشە نەبێتە مایەی دەمارگیریو هەڵچوونی خوێنەرانی بەرێزو پەنجەی دەستە گەریم بۆ رانەکێشن کە نووسەرێکی بێلایەنمو ئەم رەوشەی من بە توندرەویی لە قەڵەم نەدەن .هەروەکو ئاماژەم پێکرد , لەبەر ئەوەی گەشەکردنی تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەکانی کوردستاندا, بەهەوڵو کۆششی مەولانا خالیدو, زنجیرەی بنەماڵەی عارفو

شاعیری لاوو ناکام, حاجی شێخ عەبدولرەحمانی وەفا کەلێرەدا, لەسەرەتای نووسینی پێشەکیی دیوانەکەیدام, واتە بنەماڵەی شێخە نەقشبەندییەکانی هەورامان دەچنەوە سەر وەفا .

بۆیە بە پێویستم زانی پێشتر بە ژیاننامەیەکی کورتی وەفا, ئەم پێشەکییە برازێنمەوە .

ئێستا دووکتێب بەناوی : (الانوار القدسية) لە نووسینی شێخ محەمەد رەخاویو (رياض المشتاقين) لە نووسینی مەلا حامیدی بێسارانی, نووسەری تایبەتی شێخ سیراجودین عوسمانی نەقشبەندی باوکی پایەبەرزی وەفا لەبەر دەستدان , بەڵام لەبەر ئەوەی هەردوو نووسەرەکە, زیاتر بایەخیان بەبەرجەستەکردنی کەراماتو کارە نائاساییەکان داوە, وەبەهۆی ئەوەی شێوەی دارشتنەکەیان لە دەمارگیریی بەدەرنییە, بۆیە ناکرێ کەم تا زۆر لەم دوو سەرچاوە دوورو درێژە سوودمەند بین .

لەم کورتە باسەداو لە وەرگێرانی ئیسماعیل پاشای بابان لە کتێبی ( هدية العارفين في اسماء المؤلفين واثار المصنّفين), بەرگی یەکەم, پیتی(خ)و, هەروەها لەو وەرگێرانەی کە شێخ محەمەدی خاڵ لە پەراوێزی لاپەرە 38–53ی کتێبی

( الشيخ معروف النودهي البرزنجي) ی مەولانا خالید, سوودمەند دەبین . دیارە بەرەچاوکردنی وەلاوەنانی ئاسەواری دەمارگیریی لە نووسینەکەی خاڵو لابردنی هەندێ پەراگراف کە کاریگەریی لەسەر دەقی وەرگێرانەکە نابێت .







## مەولانا خالید, زیائوددین ئەبولبەهاو موجەددیی نەقشبەندی

بەپێی شێخ محەمەدی خاڵ , مەولانا خالید یان شێخ خالیدی کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێنە رەخاویو مەلا حامید, ناوی باوکیان بە حوسێن لەقەڵەم داوە . باوکی سەربە هۆزی مکایەڵی جافی مورادییە .

مەزاری پیری مکایەڵ کەوتۆتە گوندی دەودانی سەر بەجوانرۆ, دانیشتوانی گوندەکە پیری ناوبراو دەبەنەوە سەر عوسمانی کوری عەفان (خودا لێی ڕازی بێت) . چەند خێزانێك لە دانیشتوانی گوندەکە بە پیرزادە ناو دەبرێن . بەپێی زنجیرەو بەڵگەنامەکانیان , بەرەچەڵك دەچنەوە سەر پیری مکایەڵو پیری مکایەڵیش دەچێتەوە سەر عوسمان ( خودا لێی ڕازی بێت) .

کۆپی ئەم ڕەچەلەکنامەیە لەبەر دەستدایە, بەڵام تێیدا پەیوەندیی تیرەی مکایڵی بە پیری مکایڵەوە ڕوون نییە . بەپێی وتەی شێخ محەمەدی خاڵ , مەولانا خالید لەسەری باوکەوە, دەچێتەوە سەر عوسمانی کوری عەففان و لەسەری دایکەوە دەچێتەوە سەر سەید حەسەنی ناودار بە ئەبو بەکری موسەننیف.

مەولانا خالید لە ساڵی 1193 ی کۆچی, لە گوندی قەرەداغی سەربە قەزای مەڵبەندی سلێمانی لە دایك بووە . هەر لەتەمەنی باڵق بوونەوە, ڕووی کردۆتە خوێندنی زانستی ئیسلامیی و , زانستەکانی (عقلیة)و(نقلیة) ی لە زانا گەورەکانی سەردەمی وەکو سەید عەبدولکەریم بەرزنجی و سەید عەبدولرەحیمی برای و, شێخ عەبدوڵلای خەرپانی و مەلا ئیبراهیمی بیارەو مەلا ساڵحی تەرەماری و مەلا عەبدورەحیمی زەیاری و شێخ محەمەد قەسیمی سەنەندەجییەوە, وەرگرتووە . وبەهۆی هزری بەرزو زیرەکیی و لێوەشاوەیی خۆیەوە, توانیویەتی لە زانستە ئیسلامییەکان و بەتایبەتی لە(حکمت)و(کلام)دا, بەپلەو پایەی بەرز بگات .

شایانی وتنە , لەو ڕۆژگارەدا , شێخ مەعروفی نەودەهی بەرزنجیش , یەکێك لە گەورە زانایانی ئایین و یەکێك لە مامۆستا ناودارەکانی ئەو سەردەمە بووە, وبەپێی بەڵگەنامەو نووسراوەکان کەلەو سەردەمەوە بەجێ ماون, پلەی زانستی لە سەید عەبدولکەریم و سەید عەبدوررەحیمی بەرزنجی بەرزتر بووە . گومان لەوەدا نییە, مەولانا خالید سوودی زانستی و ئەدەبی لێوەرگرتووە. بەڵام نووسەرانی نەقشبەندی, بەهۆی چەند تێبینیەکەوە, کە بەدەر لە





بابەتی ئەم باسەیە, شێخیان لە ریزی مامۆستایانی مەولانا ئەژمار نەکردووە .

دوای ئەوەی مەولانا لەشاری سنە دەگەرێتەوە, لە شاری سلێمانی سەرقاڵی وانە وتنەوە دەبێت.سەبارەت بە بلیمەتی و زیرەکیی لە رادەبەدەری مەولانا, عەبدولباقی عومەری موسڵی دەڵێت : جارێکیان بۆ دیداری مەولانا خالید دەچووم, لە نێو ڕێگەدا مەتەڵێکم لەسەر ناوی گیای ئەفسەنتین کە لە چیاکانی ئامێدی فراوانە, دانا تاوەکو زیرەکیی مەولانا تاقیبکەمەوە . دێڕی مەتەڵەکە ئەمەیە :

بان لام العذار من الف القد فتم الوصال في عامين

هەر کەبەخزمەتی گەیشتم , لە گۆشەیەکی کۆڕەکەیدا دانیشتم و ئەو دێڕەم بۆ خوێندەوە,

یەکسەر گوتی : عەبدولباقی:گیای (افسنتين) . ئەفسەنتین لە چیاکانی ئامێدی فراوانە . منیش دەستیم ماچ کردو دانم بەوەدا نا کە زانستەکەی خوداداییە .

هەڵهێنانی مەتەڵەکەش ئەوەیە ئەگەر پیتی لام لە ئەلیفەکە لابرێت (اف) دەمێنێتەوە, وبیلکێنیت بە (سنتين)ەوە کە (2) ساڵە, دەبێتە (افسنتين) .

مەولانا خالید لە ساڵی 1220 ی کۆچی لە ڕێگەی موسڵ, دیاربەکر, حەلەب, شام و فەلەستین ڕووی لە حەج کرد . لەم گەشتەدا چاوی بەگەورە زانایانی وەکو شێخ محەمەدی کزیری و شێخ مستەفای کوردی کەوت . ولەرێگەی مەدینە بەئیقتیباس لە مەولانا عەبدورەحمانی جامی , لەحەوت بەندێکدا ستایشی پێغەمبەر (

دروودی خـوای لەسـەر بێـت) دەكـات . كـە لێـرەدا بەنـدی يەكـەمی هەردووكيان بڵاو دەكەينەوە .

بەنـــدی يەكــــەمی حــــەوت بەندەكــــەی مــــەولانا نــــورەددين عەبدوررەحمانی جامی :

این بارگاه كيست كـه‌از عرش برتراست — وز نور گنبدش همه گردون منوراست

از شرم شمسهـاى درش كعبتين شمس — برتخته نرد چرخ چهارم بەشش دراست

از انعكـاس صورت گـل آتشين او — برسنگ جاى لغزش پاى سمندر است

نعمان خجل زطرح اساس خورنق است — كسرى شكسته دل پى‌طاق مكسراست

بـهرنگاهبانى كفش مسافران — بر درگهش هزار چوخاقان و قيصر است

این بـارگاه قافله سالار اوليـاست — این خوابگاه نور دوچشم پيمبر است

این جاى حضرتيست كه از شرق تابه غرب — وزقاف تابقاف جهـان سايه گستر است

این روضه رضا است كه فرزند كاظم است — سيراب نوگلى زگلستان جعفر است

سروسهى زگلشن سلطان اوليا است — نوباده حديقه زهراو حيدر است

مـرغ خرد بكنه كمالش نميپرد — بركعبه كى مجال عبور كبوتر است؟

تاهمچوجان زمين تن پاكش ببرگفت — اورا هزار فخر براين چرخ اخضر است

براهل باطن آنچه زاسرار ظاهر است — درگوشه ضمير مصفاش مضمراست

خورشيد كسب نوركند از جمال او — آرى جزا موافق احسان مقرر است

آن كس بەبندگيش شد آزاد در دو كون — ننگش زتاج سلطنت هفت كشور است

بـرگرد حاجيا بسوى مشهدش روان — كاينجا توقفى نەچو صد حج اكبر است

بـى‌طى ظلمت آب خضرنوش ازدرش — كاين دولتى است رشك روان سكندراست

بتوان شميد بوى محمد زتربتش — مشتق بلى دليل بمعنى مصدر است





مەولانا . محمـل امشـب ديـر مـی جنبـد خـدا آغـازكن راستەقينە بوو, لەم گە, بی‌نوايـانرا نـوای ديـگر از نـوسازكن, دڵو گيان خولياى ديدارى كەسێك بوو كە دڵی بڕفێنێت يان ڕێگە بباتە سەر كێوی دڵخوازی . تاسەر ئەنجام يەكێك لە پياوچاكان مژدەی ئەوەی دایێ كە ئاسۆی هيندی بەروودا دەكرێتەوە .

دوای گەڕانەوە لە گەشتی حەج بۆ شاری سلێمانی, هێندەی نەبرد كە پياوێك بەناوی ميرزا رەحيموڵڵا بەگ ناسراو بە محەمەد دەروێش

ساربانا رحم كن بر آرزومندان زار — وعدەشد نزديك ونبود بعدازاين جاى قرار

...كن جدا نعمانى گردن فراز برق سير — بى خبر زاب وعلف كارآزماى راهوار

بى‌تأمل برگشا بند عقال از زانوش — زمره درماندەگان را اين گره واكن زكار

تاكنم برخويش آرام وآسايش حرام — تانهم يكباره خوردو خواب و راحت بركنار

كرده دەمنزل يكى ياسرنهم درراەدوست — ياكشم دردیده خاك آستانش سرمەدار

باديه پيماشد ازهر ديدەام صد قطره خون — سوى جان، دير مى جنبد چرا امشب قطار

نيست تاب سستى جمالم از شوق جمال — سوختم از آتش جانسوز هجران زينهار

حاديا خيزو بلند آهنگ كن آوازرا — آردر رقص ازنواى جانفزا جمازرا

دەلهی بەڕێكەوت .

مەولانا خاليد لەسەر ڕێگەيدا, چاوی بەم شارانە كەوت: بەستام, خـەرەقان, سـەمنان, نەيشـاپوور, تـوس‌و توربـەتی جـام . زيـارەتی مـەزاری بايەزيـدی بەسـتامی عـارفی نـاودار كـردو وستايشـی كـرد, زيارەتی مەشهەدی رەزەوی كردو بەهۆنراوەيەك, ستايشی حەزرەتی رەزا(رەزای خـوای لەسـەر بێـت)ی كـرد, كـە لێـرەدا بەشـێكی بڵاودەكەينەوە :

كـملت مسافـة كـعبة الامـال … حـمدا لمـن قـدمنّ بالاكمـال
وأراح مـركبي الطليح مـن السّرى … ومـن اعتـوار الحّـط والتّرحـال
وأزاح عني قيد حـبّ مـواطني … وعـلاقة الاحباب والامـوال
وهـموم امّـهاتي وحسرة اخـوتي … وغمـوم عـمّ اوخيـال الخـال
وأنـالني اعلى الـمآرب والأمـا … نـي, مـن لقـاء المرشـد المفضـال
مـن نـوّر الافـاق بعـد ظلامها … وهـدى الخلائـق بعـد طـول ضـلال
نجـم الهدى, بدر الدجى, شمس التقى … كنـز الفيـوض خـزانة الاحـوال
كـالارض حـلما, والجبال تمكـنا … والشـمس ضـوء,والسـماء معـالي
عـين الشريعة معـدن العـرفان وآل … احسـان, والايقـان والافضـال
قـطب الـطرائق قـدوة الاوتـاد … غـوث الخلائـق رحلـة الابـدال
شـيخ الانـام وقـبلـة الاسلام … صـدر العظـام ومرجـع الاشـكال
هـاد الى الأولى بهـدى مختـف … داع الى الـمولى بصـوت عـال
محبـوب رب العـالمين, مـن اقتـدى … بـهداه اصـبح قـدوة الامثـال
اخـفاه رب الـعـرش جـل جلالـه … في قبـة الاعـزاز والاجـلال
واسـكن بـذا الـواد المقـدس خـالعا … نعـلي هـوى الكـونين بـاستعجال
مـن شام لمعا مـن بـروق ديـاره … بمشـام روض الشـام كيـف يبـالي
آنسـت مـن تـلـقاء مـدين مصـره … نـارا فبلـي البـال بالبلبـال
فهجـرت اهلي قـائلا لهم امكثوا … ارجـع الـيكم غـبّ الاستشعـال
ونـويت هجـران الاحبـة كلـهم … وركـبت مـتن الاجـود الصّـهال
فـطوى منـازل في مسـيرة مـنزل … واهـا لجـار سـابح شمـلال
سـلب الهـوى لـبي فمـا في خـاطري … غـير الحبيـب وطيـف شـوق وصـال
قدحـان حـين تشّـرفي بوصالـه … مـن لـي بشـكر عطيّـة الايصـال ؟
فـكما قضـيت الهنـا في اشهـر … طـيّا لبعـد مسافـة الاحـوال
ووهـبت اقدامـا على طـيّ الفلا … ونـزول غـور وارتقـاء جبـال
ورزقتنـا تقبيـل عتبـة قبلـة … فـاز المقّبـل منـه بالاقبـال
فـارزق الـه العـالمين بحقـه … ادبـا يليـق بـذا الجنـاب العـالي
وأمـدنـا بلقائـه وبقائـه … وعطائـه ونوالـه الـمتوالي
زدنـا حضـورا في حضـور قبابـه … ادم الـورى بجمـاه تحـت ظـلال
زد كـل يـوم في فـؤادي وقعـه … مـادمت حيّـا في جميـع الحـال
وأمـتن مرضـيا لديـه وراضيـا … عـنه رضـا يجـدي مفـاز مـال





زانستە ئیسلامییەکاندا, دەرکەوت کە دەریایەکی بێ کەنارە . دواتر لە

از موج فتنه خـورد شدی کشتی زمین … گـرنه دراز سلسلـه آل لـنگراست
زوار ! بـر حـريم وى آهسـته پـانهيد … كزخيل قدسيان همه فرشش زشهپراست
غلمان خله كاكل خـود دسته بدستهانـد … پيوسته كارشان همه جاروب اين دراست
شاهـاستـايش تـو بعقل وزبـان مـن … كي مي توان كه فضل تواز عقل برتراست
اوصـاف چـون توپادشـهى ازمـن گـدا … صيقل زدن بـر آينه مـهر انوراست (7)

شاعەبدوڵڵای دەهلەوی دەکات, کەلێرەدا بەشێکی بڵاو دەکەینەوە :

مەولاناخالید سەلەبەیانی رۆژی دوای گەیشتنی بەدەلهی، لەسەر دەستی شاعەبدوڵلای دەهلەوی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتو یەك ساڵی رەبەق یان زیاتر لە خزمەتی پیرو ڕووناکبیرەکەی خۆیدا، سەرقاڵی سەیرو سلوكو خزمەتی دەستکورتو هەژاراندا بوو، پلەو قۆناغەکانی سۆفیگەریو عرفانی تەی دەکرد، تا ئەوەی شێخ مۆڵەتی ئیرشادو گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆی پێ بەخشیو، تامەودای (4)میل لەدەرەوەی جیهان ئاباد، بەرێی کرد . مەولانا خالید لەساڵی 1226ی کۆچی، دوای چوار ساڵ گەیشتەوە سلێمانی، ولەهەمان ساڵدا رێگەی بەغدای گرتە بەر، وماوەی (5)مانگ لە نزیکی مەزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا نیشتە جێبوو، ئەوسا بەجلو بەرگی





رێبەری تەریقەتەوە، شکۆدار بەرەو سلێمانی گەڕایەوە، وسەرقاڵی ئیرشادو ئامۆژگاریی موسوڵمانان بوو. مەولانا خالید بۆ جاری دووەم لە ساڵی 1228ی کۆچیدا، رووی لەبەغدا کرد . لە خوێندنگەی ئیحسائی کە ئێستا بەتەکیەی خالیدی ناسراوە، نیشتە جێ بوو، سەرقاڵی وانە وتنەوەو بڵاوکردنەوەی تەریقەت بوو، توانی چەندین لەزانایان بۆ لای خۆی رابکێشێت . دواجار بەهۆی نالەباری رۆژگارەوە، لەساڵی 1236ی کۆچیدا، بەیەکجاری شاری سلێمانی بەجێهێشت .

بەبی رەچاوکردنی خستنە رووی هۆکارەکانی بەجێهێشتنی شاری سلێمانی کە نووسەرانی نەقشبەندی لەوبارەوە، بەدرێژیی باسو خواسی خۆیان کردووەو تەنانەت نووسەرێکی مەسیحیش، لەورووەوە روونکردنەوەی هەیە [1] ، لێرەداو بۆ داکۆکی لەپایەو پێگەی زانستیو عرفانی بەرزی مەولانا خالید، پێویستە بڵێین کە: نووسەرانی نەقشبەندی بەخەیاڵی خۆیانو بەمەبەستی بەگژاچوونەوەی ناحەزانو دەرخستنی مەزنیو پایەی بڵندی مەولانا خالید، دووکاریان ئەنجام داوە :

**یەکەم:** هەموویان بەیەك دەنگو نزیکەی (150) ساڵە چەند بابەتێك دووبارە دەکەنەوەو بەیەکسانی لە نووسینەکانیاندا، بەرچاو دەکەون، کەبەراستی لە رووی عیرفانو لەرووی بەرز راگرتنەوە، هیچ جۆرە جوانکارییەکیان تێدانییە، جگە لەوەی بەترشو خوێکردنی سەرسووڕهێنەورەوە رەزامەندییو پەسەندکاریی کەسانی، وەکو

(1)بڕوانە بەرگی دووەمی گەشتنامەی (ریچ)

دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان ووەزیران و زانایانی هاوچەرخیان, سەبارەت بە مەولانا خالید, لە نووسینەکانیاندا هێناوەتەوەو ستایشی ئەوەی دەکەن کە پێگەو سەروەتی فراوانی هەبووەو سەبارەت بە کاروباری رۆژو ڕێزداریی مەولانا, لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە زێدەرەوی دەکەن .

**دووەم** : ئەو نامەیەی کەنووسەرانی ناوبراو لە بڵاوکراوەکانیاندا, بەنامەی مەولانا خالیدی لەقەڵەم دەدەن کە گوایا شێخ مەعروفی نەودەهی پەشیمان بۆتەوە, لەدوورخستنەوەو دەرکردنی مەولانا خالیدو لەئاکامدا, نامەیەکی بۆ نوسیووە, داوای لێبووردن یان تۆبەی کردووەو مەولانا خالیدیش وەڵامی ئەو نامەیەی داوەتەوە . ئەوەی کەئێمە لێی دڵنیاین ئەوەیە کەنامەی ناوبراو, لەمەولانا خالیدەوە نەبووە, چونکە :

**یەکەم**: لەونامەیەدا, نەك تەنیا ڕێز لە هەراو هوریاو سووکایەتی پێکردن و بەدزمانیی خەڵکی گیراوە, بەڵکو وشەی ناشایستەیان بەدەمیەوە هەڵبەستووە کەئەم شێوازە, دوورە لە شێوازو ڕەفتاری پیاو چاکانەوە . شێوازی گەورەپیاوانی ئەم تەریقەتە, بەرجەستەکردنی ڕەفتاری جوان و پابەند بوونە, بەوەی چاکە بکە لەگەڵ ئەوەی خراپەت لەگەڵدا دەکات و ئازار نەدانی کەس و بەرگەگرتنی ئازارو برسێتی و ئۆقرە گرتن بووە, نەك تۆڵە سەندندنەوە . دەگێڕنەوە پیاو خراپێك, رووبەڕوو, جنێوی بەشێخ ئەبو سەعید فەزوڵڵای کوڕی ئەبولخەیری میهنی خۆراسانی (357–440کۆچی) دا . کاتێ دەروێشەکانی ویستیان پەلاماری بدەن, شێخ ڕێگەی پێنەدان و گوتی: ئەو پیاوە لەو ڕووەوە جنێو بەمن دەدات, چونکە





خۆی بەراست و من بەهەڵە دەزانێت, کەواتە بەکەسی هەڵە جنێوی داوە نەك بەمن . ئازاری نەدەن و لێگەڕێن بڕوات بەلای کاری خۆیەوە . هەر ئەم ڕەفتارە جوان و دان بەخۆداگرتنە, بووەی هۆی ئەوەی پیاوەکە بگەڕێتەوە . لەشیخ ئەبولعەبباسی قەسابی ئامولی, پیری شێخ ئەبو سەعیدی کوری ئەبولخەیر دەگێڕنەوە کە: پیاوێك لەخانەقاکەیدا گوتی, دەبێ بەریشی شێخ ناوگەڵم پاك بکەمەوە, کاتێ ئەم هەواڵەیان بەشێخ گەیاندو شێخ گەڵێ جوامێرانە ڕیشی خۆی لە پیاوەکە نزیك کردەوە, پیاوە بێبرواکە, بەبینینی ئەم دیمەنە, گۆرانی بەسەرداهات و گەرایەوەو تەریقەتی وەرگرت .لەم جۆرە ڕەوشت بەرزییانە کە تەریقەتی سۆفیگەرانە, بەفراوانی لە شێخانی سۆفیگەریی دەگێڕنەوەو لەکتێب و بڵاوکراوەکانیاندا, تۆمار کراون .

**دووەم** : بەتایبەتی بەشی کۆتایی نامەکە, کەتێیدا هاتووە :

((..لا يخفى عليكم ان السبب الاصلي لهذه الوحشة انما هو ترك التردد وتقليد اقاويل الناس. فان صح مابلغني عنكم فعليكم بالاعراض عن الكلمات المؤدية الى الشك والوسواس .فان احوال اهل الفقر وراء العقل والعلم لايدرك بالقياس . وبعد اللتياوالتي يضمن لك هذا المسكين– ان ثبت قدمك . وما طغى قدمك بعد اليوم– ان ترى نتائج لايحمل اكثرها السفير, وتزيد على حوصلة التقرير والتحرير . ومن بعد هذا ماتدق صفاته , وماكتمه اخطى لدي واجمل )) .

پێویست بەبەڵگە هێنانەوەو لێکدانەوە ناکات کەئەم نامەیە بەقەڵەمی کەسێکی دیکەیەو ئەم داڕشتنە کەبۆنی خۆپەسەندیی و خۆپەرستی و خۆبەزلزانینی لێدێت, لە پیاوێکی وەکو مەولانا

خالیدەوە دوورەو زیاتر لە شێوازی دارشتنی فەرمانرەوایان و ئەمیران دەچێت .

هەروەکو لە کتێب و بڵاوکراوەکانی سۆفییەکاندا دەردەکەوێت, پیاوچاکان نیازیان بەرێزی هەوادارانی دونیا نەبووەو تاوانبارکردنیان بەنووسینی نامە, بەپێی خواست و ئارەزووی کاربەدەستانەوە, لەبری ستایشکردن دەچێتە قاڵبی سەرزەنشتکردنەوە . من لەو بڕوایەدام کەقەڵەمڕەوی پیرۆزی ویست و ورەی بەرزی مەولانا خالید, گەلێ لەوە بەرزترە کە پێویستی بەوە هەبێت, تا بەوەها دارشتنێك وای نیشان بدەن کەبەسەر ناحەزەکەیاندا زاڵن . مەولانا کەخوداوەند لەمیهرو بەرەکەتی خۆی بێ نیازی کردبوو, بایەخی بەدەستەبەرکردن یا تۆرانی دڵی ئەوکەسانە نەبوو . یاخود چی هانی دەدا, تاوەکو گەورەیی خۆی, بەرووی خەڵکی تردا بکێشێت, یاخود دژایەتی کەسێکی تر بکات .

هەر نووسەرێك کەبخوازێت سەبارەت بەیەکێك لە ئەولیای خودا, بابەتێك بنووسێت, رێزنان و پارێزگاری لە پلەوپایەی بەرزی, ئەرکێکی ئاینی و ویژدانییە, دەبێت رەچاوی بکات . پایەی دۆستی خودا گەلێ بەرزەو دۆستی خودا بەدوژمنی خودا ناشوبهێنرێت . نابێت وەلی بخرێتە ریزی خەڵکی‌نەفس پەرستەوە, بەخۆشگوزەرانی و زەرق و بەرقی دونیا تاوانبار بکرێت . دۆستی خودا دوژمنی کەسێك نییە کەنیازی بەهەراو هوریاو جەنجاڵ و داکۆکی بەچەك و گوتارو بازووی ئەوان هەبێت. جیهانی هەژاری جیهانێکی ئاسوودەیە . ئەبو سەعیدی کوری ئەبو لخەیر دەڵێت: گیرفانی ئێمە گرێ نەدراوەو لەگەڵ کەسێکیشدا دوژمنایەتیمان نییە, لەخودای گەورە داواکارین



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

دەروونمان بەنووری دۆستانی خۆی رووناك بکاتەوەو دروودی فراوان بۆ سەروەرمان محەمەد.

دوای ئەوەی مەولانا خالید گەیشتە بەغدا, لەتەکیەی خالدی نیشتە جێبوو و لەخانەقای سلێمانی, خەلیفە عەبدوڵڵای هەروی لەشوێنی خۆی دانا, دوای نزیکەی (2)ساڵ نیشتەجێبوون لە بەغدا, لەسەر داواو خواستی کۆمەڵێ لەخەڵکی شام,رووی لەو دەڤەرە کردو,لەساڵی 1238ی کۆچیدا, لەرێگەی دێر ئەززورەوە گەیشتە دیمەشق . لەشامیشدا بەگەرمی لەلایەن خەڵکەوە پێشوازیی کرا . یەك جار لەشامەوە سەردانی قودسی کرد, ولەساڵی 1241ی کۆچی, بەمەبەستی حەج رووی لەمەکە کردو دواتر بۆ شام گەڕایەوە .

مەولانا خالید, ماوەی نیشتەجێبوونی خۆی لەشامدا, بۆ هاودەمی و گفتوگۆ لەگەڵ زاناو گەورە پیاوانی ئیرشادو مامۆستایانی ئایین و سۆفیگەریی تەرخان کردبوو, تابەهۆی نەخۆشیی تاعوون کەلەشاری دیمەشقدا بڵاوبووەوە, شەوی هەینی,14ی مانگی زیلقەعدەی ساڵی 1242ی کۆچی, لەنێوان مەغریب و عیشادا, کۆچی دوایی کرد . پیتەکانی وشەی (مغرب) بەپێی حیسابی رستەکان, رێکەوتە لەگەڵ مێژووی کۆچی دوایی مەولانادا . باسی کۆچی دوایی مەولانا خالید گەلێ گران و مایەی دڵتەنگییە, بەتایبەتی داستانی کۆچی دوایی دووفەرزەندەکەی عەبدورەحمان و بەهائودین, بەماوەیەکی کورت بەرلەکۆچی دوایی خۆی . مەخابن لەم پێشەکییەدا, بواری باسکردنی نارەخسێت .

رەزا قـــولی خـــانی هیدایـــەت, لـــەدووکتێبی خـــۆی (مجمـــع الفصـــحاء)و(ریــاض العــارفین) دا, بــەکورتی باســی مــەولانا خالیــد دەکاتو, ئەم دوودێڕە شیعرەشی بڵاوکردۆتەوە:

کــە دێـــری دووەم, لـــەهیچ یـــەکێك لەدیوانـــە دەســـتنووس و چاپکراوەکانی مـەولانا خالیـددا نـەبینراوە . مـەولانا خالیدکـەمتر لـە( 50) ساڵ تەمەنی کرد . تەمەنێکی کورتو ناوبانگێکی جیهان گێرو

دراقلـیم محبـت از خرابیهاسـت معمـوری　　بەسیل اشك بایدکند اساس خانە ٔخودرا

اگـــر مردراهـــی دردوسـت بـــاز اسـت　　دگـــــر قصـــەگوئی حکایـت دراز اسـت

[illegible]

هەبوو . ئەگەر بڵێم مەولانا کەخاوەنی ئەم تایبەتمەندییە بەرزانە بوو, بلیمەتو بەهرەمەندی سەردەمی خۆی بوو, بەهەڵەدا نەچووم .

ئیسـماعیل پاشـا بابـانی بەغـدادی , لـەکتێبی (هدیـە العـارفین)دا, ئاماژە بەم نووسراوانەی مەولانا دەکات :

1-جـلاء الاکـدار والسـیف البتـار بالصـلوت علـی الـنبي المختـار (ص).

2-حاشیة علی تتمة السیالکوتي لحاشیة عبدالغفور اللاري علی شرح الجامي للکافیة في النحو .

3-حاشیة علی جمع الفوائد في الحدیث – طبعت في الاستانة سنة 1307 ه .ق

4-حاشیة علی الحیالي في الکلام .



5-حاشیة علی نهایة الرّملي في الفقه .



6-رسالة الرابطة في اصطلاح السادة النقشبندیة .

7-فوائد الفوائد في حدیث جبریل في العقائد (بالفارسیة) .

8-شرح عقائد العضدیة .

9-شرح مقامات الحریري . لم یکمل .

10-العقد الجوهري في الفرق بین کسبي الماتریديّ والاشعري .

11-دیوان شعره (فارسي) .

شێخ محەمەد خاڵ لە پەراوێزی کتێبی (الشیخ معروف النودهي البرزنجـي) سـەرەڕای ئـەو نووسـراوانەی ئیسـماعیل پاشـا ئاماژەیـان پێدەکات, ئـەم نامانـەی خـوارەوەش لـە نووسـینی مـەولانا خالیـد نـاو دەبات :

12-شرحة علی اطباق الذهب لجادالله الزمخشري (بالفارسیة) .

13-رسالة في العبـادات , ( بـۆ ئـەو مورپدانـەی نووسـی کەحەنـەفی بوونو دواتر بوون بەشافعی) .

14-جالبة الاکدار في تقلبات الامصار .

15-رسالة في آداب الذکر في الطریقة النقشبندیة .

16-رسالة في آداب المرید مع شیخه .

17-مکاتباته العربیة .

18-مکتوباته بالفارسیة .

ئەوەی سەبارەت بە مـەولانا خالیـد( خـودا لێـی ڕازی بێـت) ئاماژەم پێکـردووە, گـەلێ کورتـە, زۆربـەیم لـە کتێبەکـەی شێخ محەمـەدی خـاڵ (الشیخ معروف النودهی)یەوە وەرگرتووە . لێرەدا, بەمەبەستی سوود وەرگرتنی زیاتر, ئەوەی خوا لێخۆشبوو مەلا حامیدی کاتب لە کتێبی

(ریاض المشتاقین)دا, دەربارەی بیبلۆگرافی مەولانا نووسیویەتی, ئاماژەی پێدەکەم :

قطب حق سر دفتر دیوان عشق    زیور دیباجهٔ طغرای دین
یکه تاز عرصهٔ فضل وشرف    شاهباز قلّهٔ حق الیقین
غوث عالم شاه مولانای ما    آنکه گنج حکمت حق را امین
شیخ خالد ان ضیاءدین ودل لەسنور عشقش بود لایح بر جبینی
ذرّ تاج ابتهاج سابقاتی وخاتم اقبال اصحاب الیمینو
گیسن بەپێی گەورە پیاوان , دەڵێت . شێخ ئەبوبەکر زیاتوین
مەولانا خالیدی شارەزووری, لەشارەزووردا لەدایك بووەو هەر لەوێدا گەورە بووە, بەمەزهەب شافعییەتو بە تەریقەت نەقشبەندییەو لەرووی مۆڵەتەوە, قادریو کوبرەویو سوهرەوەردیو چەشتییە . کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخ حوسێنە . زنجیرەی ئەم گەوهەرە دەچێتەوە سەر وەلیو زانا پیری میکائیلی دەودانی . پیری میکائیل وەلییەکی بەناوبانگو زاناو خاوەن کەرامەت بووەو لەنێوان پیاو چاکاندا, نموونەو ناسراوبووە .

ئەم کەسایەتییە ناودارو عارفە ( مەولانا) لەسەری باوکەوە, دەچێتەوە سەر عوسمانی کوڕی عەففان, جێ نشینی سێهەمی پێغەمبەری خودا . ولەسەری دایکەوە دەچێتەوە سەرسەید سەنەد





وەلیولڵا شێخ سەید محەمەد ناسراو بەپیر خزری شاهۆ (خودا راز داری بکات) . وزنجیرە شەجەرەی ئەم پیرە راستو دروستە, وبەوەلیو قوتب ناسراوەو زۆربەی ساداتی کوردستان (سنە)و ئەفشارو ساوجبلاغو شارەزوور, زنجیرەی خۆیان بەپێی زنجیرەی پیر خزر راست دەکەنەوەو سەید سەنەدی زانا بەولایەتی موتتەسیف مەلا ئەبو بەکری ناسراو بە موسەننیف کە خاوەنی کتێبی ( وضوح وسراج الطریق وغیرهما )یە, سەربە بنەماڵەی پیری خزرە .

شەدین شاهباز ذی جناحین    کەبد شخص جهان رامردم عین
سرو سرهنگ ارباب دیراست    رئیس خیل اصحاب ولایت

حەزرەتی مەولانا خالید لە 1193 لە شارۆچکەی قەرەداغ لە دایك بووە, کە سەربە شاری سلێمانییە, وئەو نەونەمامەی کە سومبڵی پاکیو کەماڵ بوو, نزیکەی (12) ساڵ لەو سەرزەمینە پاکەدا مایەوەو لەبەرەکەتو فەزڵی ئەوە کەشارۆچکەی قەرەداغ داغی نەوجوانێکی بەتەوێڵی ئیرەمەوە ناوە .

ولەو هەوارگەیەدا قورئانی خوێندووەو تەسریفی زەنجانیو هەندێ لەپێشەکی زانستی رێزمان (علم نحو)ی تەواو کردووەو لەمەسەلەی دەركو تێگەیشتنی یەکێتی هزر, بەجۆرێ بەتوانا بووە کەهەر لەسەرەتاوە بەئاسانی سورەی فاتحەو فەلەقو ناسو ئیخلاسو مەسەدونەسری خوێندۆتەوە . دەگێڕنەوە کە مامۆستاکەی, وەکو باوە دوای ئەوەی کەسورەی نەسر تەواو دەکەن, داوای مریشکی رەش لەتەلەبەکانی دەکاتو لەمەولاناش داوا دەکات . ئەویش

بەمامۆستاکەی دەڵێت: مامۆستا من هێندە لەباوکم شەرم دەکەم ناتوانم داوای مریشکی لێبکەم, تۆ لەسەر کاغەز شتێکم بۆ بنووسە, تانیشانی باوکمی بدەم . مامۆستا لەسەر کاغەز, مریشکی رەش دەنووسێت و دەیدات بەدەستی مەولانا . هەر کەتەماشای کاغەزەکە دەکات, لەژێر لێوەوە شتێك دەخوێنێتەوە. مامۆستا بەسەر سووڕمانەوە لێیدەپرسێت :چیم نووسی؟ دەڵێت : مریشکی رەش .

بەکورتی بەو تەمەنە کەمەو لەماوەیەکی گەلێ کورتدا, شارەزایی لەشیعرو پەخشان و وتەی شیرین و رەوانبێژی و رەفتاری جواندا پێش دەکەوێت و لەرووی ڕەوشت بەرزی و بڕواداری و قەناعەتەوە هەر لەتافی لاویدا, لەنێوان خەڵکی ئەو ناوچەیەدا, ناو دەردەکات و بەخواستی خوداوەندی مەزن, توانی بەهرەو ئامادەگی خۆی گەشە پێبدات و ببێت بەشابازێك و لەناو جەنگەڵی هزری خۆیدا, هەستی بە هێزو توانایی دەستەبەرکردنی باڵندەی حوکم و رازەکانی کردووەو لەهەر شوێنێکدا, هەواڵی زانایەکی گەورەو شارەزای بیستبێت, بەمەبەستی مەلەکردن لەدەریای زانستیدا, خۆی پێگەیاندووە, تاوەکو لەهەرکانییەك گەوهەرێك ولەهەر دەریایەك مرواریيەك بچنێتەوە :

لاجرم شد مخزن اسرار علم ومعرفت    لجّهٔ بحر علومش موج زن عمّان صفت

لەو گەورە پیاوانەی, شانسی ئەوەیان هەبوو مامۆستای ئەو ئەستێرەیەی بورجی زیرەکی و بلیمەتی, وخۆری ئاسمانی رەهایی و ئازادی بن, وخۆری بەرەکەتی هاوڕێیەتی ئەو ئاسۆی رێنموونییە, بەروویاندا هەڵهات :زانای کارگێرو پڕو خاوەنی هزری بێگەرد, شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی و برازاکەی, شێخ عەبدورەحیم بوون . ئەم





دووبرا پایەبەرزە کەدوو درەختی بەرداری خۆشبەختی بوون, سەر بەبنەماڵەی ساداتی بەرزنجی بوون . لەسەردەمی خۆیاندا بەنوری زانست و مەعریفەی خۆیان, شاری سلێمانییان رازاندۆتەوە, بەتایبەتی براگەورە شێخ عەبدولکەریم ناسراو بەوەلی, پیاوێکی کامڵ و زیرەك و بەئاگابووە. یەکێکی تر لەو مامۆستایانە,زاناو سەرچاوەی رازەکان و ماناکان: زانای تەواو عەیارو توێژەرو وردبین مامۆستا مەلاساڵحی تەرەماری و زانای کارگێڕو پیاو چاك و خۆشەویست حەرزەتی مەلا ئیبراهیمی بیارەیی و زانای بەتواناو سومبلی هۆش و بیری تیژی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی .

مەولانای چەقی بازنەی کەماڵ و گلێنەی چاوی زێبایی, بەمەبەستی بەدەستهێنانی زانستەکان, کۆیەو حەریریشی رووناك کردۆتەوەو, لەخزمەتی زاناو مامۆستا مەلا عەبدورەحیمی زیادی ناسراو بە مەلازادە کە لەبواری هونەرەکانی زانستدا کارامە بووە, شەرحی جەلالی مەنتیقی خوێندووە .دووبارە بەرەو شاری سلێمانی گەڕاوەتەوە, دواتر مەولانا , خۆری ئاسمانی شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەت, شەرحی شەمسیەو موتەووەل و عیلمی کەلام و حیکمەتی لە سلێمانی, لەسەردەستی زانایانی ئەو شارە خوێندووەو دواتر بەرەو بەغدا رۆیشتووەو لەو شوێنە پیرۆزەدا (موختەسەری مونتەها)ی لەخزمەتی گەورە نووسەران و هزرمەندان سیبغەتوڵڵا ئەفەندی ماوەرانی تەواو کردووە . جارێکی تر بەرەو شاری سلێمانی گەڕاوەتەوەو ئەم شابازە بەرزە فڕە, کەوتۆتە شکارکردنی زانستە وردەکان و ڕازە ناسکەکان .

دەگێڕنەوە کاتێ لەسلێمانی لەدەریای وەدەستهێنانی زانستەکان‌و مەعریفەکان‌و نهێنیەکاندا مەلەی کردووەو مرواریی مەعانی وتۆتەوە, مەلا عوسمانی باڵەخی کەیەکێك لە زانایانی ئەو دەڤەرە بووەو وەلییەکی ناسراو بووە, کەهەستی بەنوری هەڵهاتنی خۆری ئەولیا کردووە, لە تەوێڵی پاکی ئەو گەوهەرەداو بۆنی شنەبای غەیبی, لەو زاتە کردووە . بەواتەی ئەم شیعرەی حەزرەتی مەولەوی کە :

پیرایشانند کاین عالم نبود جان ایشان غرق بد دربحرجود
بوده پیش از خلقت انگورها خورده می‌هاوغوده شورها
دردل انگورمی‌را دیده اند درفنای محض شی‌را دیده‌اند
دیده چون بی کیف هر باکیف راه زدیده پیش ازکان صحیح وزیف را
ودرتموز گرم می بینندەی, ودرفنای محض می بینندشی
دمطلع برنقش هرچه هست شده, وپیش ازان که نقش گل بایست شده

حوجرەکەی دەکات, وهەرکە لەدەریاچەی ئەو گوڵزارە گەشاوەو سەروەری پاکی‌و بێگەردی دەبێتەوە, مەلی غەیبی ئەو حەزرەتە لەقەفەسی ئەو زانایەدا لەشەقەی باڵی داوەو ڕووی لەبیابانی جیهانی ماناکان کردووە, واتە ئەو گەوهەرە لە خەودا دەبێت :





مرغ جانش گشتەآزاد ازقفص دلی فارغ از اندیشهٔ دام‌و مفصی
همچو بلبل بذلەگوچون فاختە درگلستان معانی تاختە
گاه درگلزارو گاهی درچمن می‌پرد گرم سفر اندر وطن
از غم وشادی عالم رستەاست فانی از خویش وبحق پیوستە است

وبوون رابکێشێت‌و بەئاگای بهێنێتەوەو تاوەکو بواری گفتوگۆ لەنێوان ئەو دووکەسایەتییە قسەزانەدا برەخسێنێت . مەلا عوسمان ڕێگەی پێنادات‌و پێی دەڵێت کەئەو رووپۆشەی, وەکو هەور بەر رووی مانگی چواردەی گرتووە, لابەرێت, تا لەدوورەوە چێژ لە دیمەنی زێبای ئەو مانگە وەربگرن‌و هەروەکو لەبەرەکەتی گفتوگۆ کردن لەگەڵیدا بێ بەریی بوون, هەر نەبێ لەخوێندنەوەی دیمەنی جوانی بەهرەمەند بن‌و بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە . حاجی حەسەن لەسەرداوای مەلای گیرۆدە, رووپۆشەکە لەسەر رووەمەتی ئەو ئەویندارە مەستە لادەبات . ومەلا بۆ ماوەیەك بە وقارەوە بەرامبەر ئەو سەرچاوەی نورە دەوەستێت‌و دەست بەڕازو نیاز دەکات کە : خودایا ئەم گوڵی گوڵزاری مەعریفەتە لە زیانی هەڵوەرینی ناوداری‌و بەناو بانگی بپارێزەو بەبۆن‌و بەرامەو بەرەکەتی, جیهان بۆندارو خۆشبەخت بکە , ورووەدەکاتە حاجی‌و دەڵێت : ئەم پیاوە کەسێکە کەدیدەی جیهان بەهۆی ئەو نورانی‌و, هزری نەوەیەك لە خۆشبەختان بەهۆی شنەبای رێنموونەکانیەوە بۆندار دەبێت, وئەوسا بۆ شوێنی خۆیان گەڕانەوە .

دوای گەڕانەوە لە بەغدا, دووبارە دڵی بۆ زانستی ماتماتیك‌و ئەندازەو حیساب لێیدا . وبەمەبەستی بەخزمەت گەیشتنی زانای

لێهاتوو وخاوەن بیری تیژو دەرکی راست, ئەبو عەلی سینای سەردەم, شێخ محەمەد قەسیم, ڕووی لە شاری سنە کردو لەماوەیەکی کەمدا , ئەو زانستانەی تەواو کردو دووبارە بەمەبەستی تەواو کردن و وانە وتنەوە,ئەسپی خۆی بەرەو سلێمانی تاو دەدات . گەورەو بچووکیی ئەو دەڤەرە, بەشادیی و خۆشییەوە, ناوەڕۆکی ئەم دێرەشیعرەی خوارەوەیان دووبارە دەکردەوە :

آمدی وەچە عجب خرّم وخندان گشتیم تشنه بوديم وقدين لب عمّان گشتيم

سالها در طلب يوسف گم گشتهٔ خويش لەیدربیابان طلب والەو حيران گشتيم

عمژدەگان یوسف مابازبکنعان آمدیاتدیده روشن بجمالش شدو شادان گشتيم

مخسته بوديم و بمامژدهٔ درمان آمد فرد مرده بوديم وهم آميخته باجان گشتيم

بەناوی وانە وتنەوە, وەکو مامۆستا دەستنیشانکراو پایەی شکۆمەندی بەلای هەموانەوە پەسەند بوو, بەو پەڕی خۆی گەیشتبوو . ماوەی نزیکەی (8)ساڵ, ئەو ئەستێرە پایە بەرزە,سەرقاڵی وتنەوەی زانستە رەسمیی و نارەسمییەکان بوو وبەرێنمونکردن بەکاری چاکەو دووری لەکاری خراپە, توانی تۆوی خۆشبەختی لەدڵی زۆربەی دانیشتوانی ئەو دەڤەرەدا بچێنێت و گوفتارو کرداری مەولانا, بەلای زانایان و پیاوچاکان و فەرمانڕەواو ئەمیران و پیاو ماقوڵان, دەقی یەکلایکەرەوە بووەو بەڵگە هزریی کردەکانی روون و ئاشکرا بوون ,





هەر خاڵێک کە ئاماژەی پێکردووە , دووربووە لە سەختگیری . زانست و مەعریفەتی گەیشتۆتە ئەو پەڕی و کەماڵ و هونەرو, خواپەرستی ئەو زاتە جیهانگیر بووەو لە دۆزینەوەی راستییەکاندا , پلەو پایەی بەرزی هەبوو .

حگە لەخۆشەویستیی دۆست , شتێکی دیکە لەدەمارو پێستیدا

ازهمه بود بمعنى چو الف صفر مجرّد گرچه برمسند عزت شه باخيل وحشم بود

ندم زحشمت چەزنم خاك نشين سركويش نێك عارش از تخت فريدون وكى و حشمت جم بود ی

ئـ[illegible] پەیوەندیی [illegible] , [illegible] راز داری بکات و لەبەرەکەتی بێبەشمان نەکات , ئامین .

دوای ئەوەی خۆری زانست و مەعریفەی خۆشبەختی و هیدایەت , نزیکەی هەشت ساڵ لە سلێمانیدا مایەوەو بەبەرەکەتی خۆی ئەو لایەنانەی نورانی کرد, لە ساڵی 1220دا, کەڵکەڵەی زیارەتی ماڵی خوداو مەزاری پاکی سەروەری جیهان (دروودی خودای لەسەربێت)کەوتە سەری و دەستی لە هەموو دارو نەداری خۆی هەڵگرت, بەوێنەی مەستان و سەرخۆشانی نێو دێری : گرنیاید بخودش موی کشانش آرید (گەر خۆی نەهات بەقژ رایبکێشن و بیهێنن)بەنیازی کۆچ بۆ لای خوداو پێغەمبەرەکەی, ڕووی لە حیجاز کردو هەر شتێکی بەهاداری هەبوو, بەبێ گوێ پێدان, هەمووی بەخشی :

چون نرود درپی صاحب كمند آهوى بيچاره بگردن اسير

مـەولانا کـە سەرچـاوەی رازی خـودا بـوو , لـە هـەموو بوارەکـانی زانسـتدا, هـەولّی دەسـتەبەر کردنـی داوەو, ڕووی لەهـەر دەڤـەرێك کردبێـت , یەکـەم جـار سـۆراغی زانایـانو گـەورە پیـاوانی کـردووە, تاوەکو لـە هـەردرەختێك میوەیەك بەدەست بهێنێتو لەهەر گوڵزارێك گوڵێـك بچـنێت, بۆیـە لـە مـەودای نێـوان سـلێمانیو شـامدا, چـاوی بەکۆمەڵێ لە زانا ناودارەکـان کـەوتووەو ئاشـنایی لـە گەڵیانـدا پەیـدا کردووە.

آری زچنان کسی چنین می‌شاید کز خیّر فحص جز نکوئی ناید

بەتایبـەتی لەشـام کـە لەخزمـەتی زانـاو توێـژەرو وردبـین شـێخ محەمـەد کەزبرییـدا بـوو کـە مامۆسـتای (دار الحـدیث)ی شارۆچکەی شام بوو, هەروەها بەخزمەتی قوتابی پایە بەرزی شێخ محەمـەد, شـێخ مسـتەفای کـوردی گەیشـت کـە هـەردووکیان لـە زانسـتو سـەلاح لـە زانستی نوێدا, هاوتایان نەبوو :

آن دو ینبوع معانی وحکم آن دو بحر علمو دریای عـیان
آن دوشهباز فضای معرفت وآن دوشاه ملك تقریر و بیـان
آن دو تیر جعبهٔ فضلو هنر وآن دوقوس تیرامرکن فکـــان

ولـەبواری زانسـتەکانی ئەسـنادداا, لەبەرەکـەتی مۆڵـەتی زنجـیرەی پاکی ئەو دووزاتە, بەهرەمەند بوو . جگە لەوەی مۆڵەتی خوێندنەوەی وێردو زیکرو نزاو تکاو هەرچی پەیوەندیی بەو مۆڵەتەوە هەبێت , لـەو دوو پیاوە گەورەیەی وەرگرتووە ولەتەریقەتی قادری , سالأنێکی زۆر





, مۆڵەت پێدراوبووە, دواتر بە یارمەتیی خوداوەند, لـە ولاّتـی شامەوە لە گـەڵ پیـاوانی خـودادا , دوور لـەلادانو کاری زشت, گـەه لەخۆشـی دیداری دۆست بەگریەو ناڵین, ڕووی لەدیاری حەج کردووە.

مـەولانا وەکـو باڵندەیـەکی ئـۆقرە لێهـەڵگیراوی گـوڵزاری دۆسـت, وەکـو پەپوولـەی خولیـای مـۆمی دیـدار, بـەدڵێکی پـاكو دڵسـۆزیو ویستی بەرزو مرازەوە, گەیشتە شاری مەدینـە, هـەروەکو بڵێـی ماسـی دوور لەئاو بەهەزار پەژارەییو نیگەرانییەوە, بەدەریا گەیشتبێت :

قطره ناگه بعمّانی رســــید خویشتن را ناپدیدو محو دید

لەبەر ئەوەی بەخاکی پاکی ئەو شوێنە, ئاوێنەی هزرو بیری خاوێن کردەوەو ئەوەی کەدەبوا بەدەستی بهێنێت بەدەستی هێناو, ئەوەی کە دەبوا بیبینێت بینی, لەبەر خۆیەوە ئەمەی بەسەر زماندا هات :

دل زخـاك کـوی جانـان یافتـه اسـت آنچه خضر از آب حیوان یافته است
نـی‌غلـط گفـتم کـه خضـر آب حیـات نیز از آن چـاه زنخدان یـــافته است
شـد طفیـل و چـاکـــراین آستـــان این شرف روح القدس زان بافته است
خودچـه گـویم گرنبـی و گـرولی اسـت ریزهٔ زین خـوان احسان یافته است
قطـرهٔ از دجلـــــهٔ احسـان اوسـت آنچـه ابرولجّـه وکـان یافتـه اسـت
ازوجـودش شـد عـدم احسـان پـذیـرئەرۆوز ظهـورش دهـر امکـان یافتـه استهـ

و ـیحـ یٚ

مـۆمی ئـەو شـوێنە پاکـە بـە نـووری پـاکی دادەگیرسـێت, وکەسـێك پەپوولە ئاسا, بیٚ پەروا خۆی بەمۆمە تواوەکەدا دەدات و دەسووتێت , ولەبــەر ئــەوەی تینــووی خواســتێکی راســتەقینەیەو ئەگــەر دەم بەهەزاردەریاوە بنێت , هەر دەڵێت: هل من مزید ؟

وبەهــەر کەسـێك بگـات پرسـیاری ئـەو قـەڵمڕەوە بـیٚ کـەنارەی لێدەکات.

نەحسنش غایتی دارد نەسعدی راسخن پایان  بمیرد تشنە مستسقی ودریا همچنان باقی

ناگەهان سەودای ئەوەی دەستی پاڕانەوەو داخوازی بگەیەنێتە دڵدارێك و لـەخۆی و خۆویستی دوور کەوێتـەوەو بخرێتـە نێـو نـاخی دڵی خۆیەوە :

پـیر رابگــزین کـــەبیٚپیراین سفــــر    هست بـس پـرآفت وخـوف وخطـر
آن رهـی کـــە بـــارها تــو رفـــتەیی    بیٚقـــــــلاو وزانـــــدران آشــفتەیی
پس رهــی راکــە ندیدستی تـو هـیچ    هـــــین مــروتنها زرهبر سـر مپـیچ
غــــولت ازرە افــکند انـدر گزنــــد    ازتـــو زیـرك تـر دراین رەبس بـدند
صـد هــزاران سـالە راە ازجـادە دور    بـــــــردشانو کردشـــان او ببرعـــور
اسـتخوان هـــاشان بـبین وموبشـــان    عبرتـی گـیرو مـــــران خــرسویشان
گـــردن خـــرگیرو سـوی راە کـش    سـوی رهبانـــان ورە دانـــان خـوش
دشمــن راهســت خــــرمست وعلــفارەای بساخـــــربندە راکــــــردە تلـفی،

لەهەر زانایەکدا بە دوای پیرێکی کامڵو ڕێبەرێکدا دەگەڕا :





چـون کسـی گـم کـردە باشـد کالـەیی    مـی دود چـــون نقطـــۀ جوّالـــەیی
هـر طـرف پرسـان وجویـان دربـــدر    بـی محـابـــا درطلـــب بـی پاوســـر
هـــــرکسی اورانشــانی مـــی دهــد    گــوش سـوی هـر بیـانی مـی دهــد
تـــــــاکجا آن گـم شـدە آیـد بکـفەگیٚگشتـــــــە دل تــیر تمنّــی راهـــدفی

مەدینەدا بووم و لـە ناخداو بە ڕواڵەت لـە دانیشتوانو حاجیانی ئەو شـوێنە پاکـە داوای ئامۆژگـاریو پەنـدم دەکـرد . لەگـەڵ کەسـێکدا کـە خەڵکی یەمەن بوو, پیاوێکی نورانی و خێرو بەرەکەت لە ناوچەوانی دەبـاری , ئاشـنابووم , وەکـو نـەزانێك کـە پرسـیار لـە پیـاوێکی زانـاو کامڵ بکات , داوای ئامۆژگـاریم لێکـرد و سـەبارەت بـە چۆنیەتی ڕێـو ڕەسمـی مامـەڵکردن, داوای ڕێنمـوونیم لێکـرد و ئـەویش وەکـو پیرێـك ئامۆژگاریی پێویستی کردم کە چۆن لەو شوێنە پیرۆزەدا رەفتار بکـەم . هـەروەکو بڵێـی لـە نـاخی دڵمـدا , مۆمێکی لـەدەرك و رازو هێماکانـدا هەڵکرد ویەکێك لە ئامۆژگارییە رێزدارەکانی ئەوەبوو کە هەر گەیشتمە شـاری مەدینــەو بەدیـداری ئـەو شـوێنە پـیرۆزە شـاد دەبم , لەگـەڵ ئەوانەی تەواف دەکەنو ئەوانەی کە ناکامن و لەگەڵ حاجییەکانی ئەو مەڵبەنـدەدا , رەخنـەگر نـەبمو, ئەگـەر بینـیم کەسـێك بـە پێچـەوانەی شـەرعەوە جولاّیـەوە , ئـەو رەفتـارە بیٚفـەڕ نـەزانمو بەلەخۆبوردنـەوە مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـەم, چونکە فەرمانڕەوایانی جیهانی ئیمکان لـەو شـوێنەدا , دەبیٚ زانستی خـۆی بـەهیچ بزانێت, چونکە هـەر وتەیـەك کاتی خۆی و هەر تێبینیەك شوێن خۆی هەیە .

لەبەر ئەوەی بە دیداری کەعبەی پیرۆز شادبووم و دەستم بەر ئەو گەوهەرەکەوت, رۆژی هەینی رووی نیازم کردە کەعبەو (دلائل الخیرات)م دەخوێند ولەدەرکەوتنی مەزنیو شکۆمەندیی حەزرەتی حەق , سەرم سوڕما, لەپڕ پیاوێکی ریش سپی کە جلو بەرگی خەڵکی رەشۆکی لەبەردا بوو , بینیم کەپشتی کردبووە کەعبەو بەرامبەر بەمن وەستابوو , لە ناچارییەوە دەریای غیرەتم کەوتە جۆشو خرۆش , موسا ئاسا ئامۆژگارییەکانی ئەو پیرە یەمەنییەم فەرامۆش کرد کەوەکو خۆر وابوو , و(لقد جئت شیئا نکرا)م بەبیردا هێنایەوەو رووی دڵم لەو بێ ئەدەبیەی کەبینیبووم وەرگێڕا . ولەبەر ئەوەی ئەو پیاوچاکە یەکێك لە ئەولیا بوو, لە یادەوەری من بەئاگا بوو . لە رووی گلەییەوە پێی راگەیاندم کە : فلانی ! مەگەر هێندەش نازانیت کە حورمەتی پیاوی بڕوادار بە لای خوداوەندی گەورەو پیرۆزەوە , لە حورمەتی حەرەم بەرزترو شەرەفی دڵداران لە شەرەفی کەعبە بالاترە :

| | |
|---|---|
| دل بدست آور که حجّ اکبر است | از هزاران کعبه یك دل بهتراست |
| کـــــــعبه بنیـــاد خلیل آذراست | دل نظرگـــــاه جلیل اکبر است |

کەواتە, لەم مامەڵەیەدا, بۆچی لەگەڵ مـن ئینکاریت کردو ئامۆژگارییەکانی ئەو پیرە یەمەنییە کە لەشاری مەدینە, لەم بارەوە ئاراستەی کردی, فەرامۆشت کردو دەرگای رەخنەت ئاوەڵاکرد .

دوای ئەوەی مەولانا ئەو کەرامەتەی لەو پیاوچاکە بینی , بەناچارییەوەو بەراستگۆییو نیازو پارانەوە , رووی کردە ئەو زاتەو گوتی : ئەی گەوهەری پلەی ویلایەتو ئەی هەوری بورجی دیرایەت,





دەزانم تۆ یەکێکی لە پیاو چاکان و ئاگاداری رازەکانی خوداوەندی , یەکەم: بەهۆی ئەو بێ ئەدەبییەوە کەکردم بمبوورە , ودووەم :منی وێڵ بەرەو رزگاریی رێنموێنو بکە, ماوەیەکە جۆشو خرۆشێك لە یادمدا سەری هەڵداوە, ئارەزووی خۆ بەستنەوە بە کەسێکی وەکو تۆ دەکەم , ئەگەر بەلوتفی خۆت پەسەندم بکەیت وئەگەر قوفڵی دەرگا داخراوەکانم بەکلیلی هیمەت بکەیتەوە , ئەوا چاکەم لەگەڵدا دەکەیت . ئەو پیاو چاکو پاکە کە بەئاگا بوو لەرازەکانی سەرەتاو ئاکام, لە وەڵامی ئەو شابازەدا فەرمووی و گەوهەری رازی بەم جۆرە دیارییەکە عاشقی سەرگەردانو ئەی پەروانەی دەوری مۆمی پیرۆز , بەهرەی تۆ وەکو شابازێکە کەلەتوانای هەر قاژێکدا نییەو هەر گوڵزارێك شایستەی پەروەردەکردنی تۆ نییە , شوێنی نیشتەجێبوونی تۆ بازووی شەهریارێکی ترە و تۆ شایستەی گوڵزارێکی تری .

| | |
|---|---|
| ساعدشه مسکن این باز باد | تا ابد برخلق این درباز باد |

وئەم مژدەیە بەتۆ دەدەم چونکە لەم گەشتەتدا, بەباشترین کاریگەرییدا چوویتەوەو قەڵەمڕەوی خۆتت بەبەرەکەتی ئەم سەردانەت پیرۆز کرد, ئەوسا :

| | |
|---|---|
| بـــوی جانی سوی جانت میرسد | بـوی یار مهربانت می‌رسد |
| قاصدی فرخنده پی از طرف حی | آید وزآنجا نشانت میرسـد |

مەولانا ئەو شۆرە سوارەی مەیدانی زانستو عیرفانو سەرفرازی و ترۆپکی پاکیو بڕوا , گەه بەهۆی ماڵئاوایی لە مەزاری پاکی پێغەمبەر, دڵتەنگو گەه لە خۆشیی گەیشتن بە کەعبەی پیرۆز شاد بوو :

فتادەام بمیان دو دلبرو خجلم　　　کەدل بمهر کەبندم دراین میان دودلم

بە دڵێکی پڕ لەشەوقو ئارەزووەوە , مەولانا بەرەو مەککە بەڕێکەوتو ئەو کۆترە, بەدەوری کەعبەدا تەوافی کرد, گەه بەشەوقو زەوقی ئەو پێگەیە, وەکو پابەندێکی مەستو گەه وەکو عاشق سۆزی دەکرد, گەه لە هەوڵی ماچکردنی بەردەڕەش (الحجر الاسود)دا دڵی لێیدەداو گەه بەهۆی مەستبوون بە چوار پایەکە لە جۆشو خرۆشو ناڵەدا بوو , لەهەوڵی مەروە, ژیانی بەدڵی مردوو بەخشراو لە هەوڵی سەفا, سەفای بەگیانی پەژموردە بەخشی . لەمەرمادا , دێوی نەفسی سەنگەسار کرد . لەعەرەفات رووی لە عرفانی جودایی کرد. پرسیاری لەگەڵ راستی کەعبەی پیرۆزدا , هەمووی دەرخستنی لاوازیی و بێتوانایی و پاڕانەوەو لەخۆبوونەوەو نیاز بوو, لە وەڵامی کەرەمو میهرەبانیو دڵدانەوەو بەخشینو بەرزکردنەوە بوو .

لە سەرێکەوە گریانو ئەشکبارانو لە سەرێکەوە دڵدانەوەو غەمگینی .

بـــــردر آمد بندهٔ بگریختە　　　آبـــــروی خود بعصیان ریختە
مغفرت دارد امید ازلطف تو　　　زانکە خود فرمودەیی لا تقنطوا



* * * *

رو درصف بندگان ماباش ومترس　　خـــاك دراستان ماباش ومترس
عـــالم همەگر قصد بجان توکنند　　دل دارقوی ازان ماباش ومترس

دواتر بەکاری چاکەو هەوڵی سوپاسکراو وگوناهی بەخشراو , دووبارە پەنای بە رەحمەتی خودا بردو رێگەی شاری مەدینەی گرتە بەر , ولەم ماوەیەدا, بەدەم سۆزو گریەو ناڵینەوە, ئەم چەند دێرە شیعرەی هۆنیەوە :

واحسرتـــا جـــدا شدم ازخـــانە خـدا　　از غصّهٔ وقت گشت شود جان زتن جدا
مارانبود خواهش رفتن زکـوی دوست　　امّـاچو امـــر اوست زسر میکنیم پا
اهـــل صفـــا بداغ غم مـروه مردەاند　　من شاد چون زیم کە شدم دوراز صفا
حـــــجر ومقام وزمزم وارکـــان ملتزم　　گوینـــد بـــازگرد کجـــا مـیروی کجـا
دامان دل گـــرفتە کشندم کشان کشان　　حنّانە روضە منبر ومحراب مصطفی
از اشتیاق یثرب ودرد فـــــــراق بیت　　گاهی است دل فتـــادە میان دوکهربا
خالد چو دوست درهمە جاجلوە گربود　　پس غم مخور زخانهٔ او گرشدی جدا

ولەبەر ئەوەی ئەو گەشتیارەی پەرچەمی مەعریفەو دەركو ئەو مەلەوانەی دەریای بەختەوەری و رێنموونی , دوای ئەوەی کە ئەسپی هیمەتی خۆی لە مەیدانی بەرەکەتدا تاودا , بەوەی کە :

رشتهٔ درگردنم افکندە دوست　　　می کشدهرجا کە خاطر خواە اوست

ماڵ بەماڵ مات‌وسەرگەردان‌و ئاڵۆزو لەرزۆك‌و سووتاوی عیشقی حەزرەتی دۆست لەچەقی سینەیدا, كڵپەی ئاگر بەرز دەبێتەوە, زماندا هات :

62

ای جـــلوەگاه ایزد دار الـوداع    ای قبلەگاه احمد مختار الـــوداع
ای شافع گروەگنە كار روز حشر    وی دافع شكوە ستمكار الـــوداع
ای آشیان طـــایر ارواح اصفیا    وی آستان حضرت دلدار الـــوداع
ای مطلع كواكب انوار ایـــزدی    وی منبع لطایف اسرار الـــوداع
خالد چە دیر آمدی وزود میروی
باشادی كم و غم بسیار الـــوداع

وەكو ئەوانەی بە كۆتایی دەگەن‌و دوای بڕینی ئاوەدانییەكانی ئاسۆیی‌و تەیكردنی پێگەو شوێنەكان‌و ئەركی گەشت بەرەوخوداو لە خودادا , خۆیان دەگەیەننە ئەڵقەی دۆستان لە كەعبە :

رو در آگم شو وصال اینست وبس    تومەان اصلا كمال اینست وبس

لە خومخانەی یەكتابوون‌و چێژی شەرابی فەنای بەچێژو ڕەتكردنەوەی بوونی پێیان چێشتووە , بەگەڕانەوەو گەڕان بەدوای خودا و بەخودا, بەمەبەستی بانگێشتی پەیڕەوی جیهانی ئیمكان و ئاوەلاكردنی داوی ئارەزووە جەستەییەكان دەیانگێڕنەوە :



بەهۆی دووركەوتنەوەی كۆتر , لەناڵەو شیندا , وگەهـ لەخۆشی خاكی پاكی ڕەوزە لەشادیدایە, تیری غەم گیانی پێكاوە, ئەم دێڕانەی بەسەر

تاكنون فرمان پذیرفتی زشاه    بعد ازاین فرمان رسانی برسپاه

دەستی ئەجەل ڕەشمەی ئەسپی سەركەشی تەگبیری رادەكێشێت و دەیگێڕێتەوەو سەر لەنوێ شنەبای ڕەحمان بۆنی غەیبی خۆی بەسەر هەوادارانی شاری سلێمانیدا دەبارێنێت . لە خۆشی هاتنەوەی , گۆشە گیرانی چاو لەڕێ, دەهۆڵی شادی لێدەدەن و دەڵێن : الحمدالله الذي اذهب عنّا الحزن , سوپاس بۆ خودا كە غەمو پەژارەی لەسەر [illegible]

انصـــاف بـــدە ای فلـــك مینـــا فـــام    زیـن هـردو كـدام خـوبتر كـرد خـرام
خورشید جهان گردتو از جانب صبح    یامـاە دل افـروز مـن از جانـب شـام

باڵندەی خولیای پێشوازیكەران, وەكو قومری لەدەشت‌و بیاباندا

جـــان باســـتقبال جانـــان مـــیرود    تشـــنە ســـوی آب حیـــوان میـــرود
روز فـراقش صـبر كـردن كـی تـوان    جسـم اگـر بـاز ایسـتد جـان میـرود
تـــازكف وامـــان یـــارم شـــد بـــرون    خـونم از مـژگان بـدامان میـــرود

پێشـوازیکەران وەکـو بولبـولان دەیانخوێنـد و مـژدەی هاتنـەوەی مـەولانای کـانزای عیرفانیـان دەدا بـە گـوێی هەمـوانـدا , ولەبـەر ئـەوەی مایـەی ژیـانی جیهان گەیشـتبۆوە شـاری سـلێمانی , هـەر وەکـو بڵێـی سەر لەنوێ گیان بەبەری خەڵکی ئەو دەڤەرەدا کرابۆوە , تـاوەکو هـەر کەسـەو بـەپێی توانـایی و تاقـەتی خـۆی لەوسەرچـاوەی عیرفانـە , تینویـەتی خـۆی بشـکێنێت .ودانیشـتوانی ئـەو دەڤـەرە لـە زانایـان و فەرمانڕەوایان و پیاو چاکان و گەورەپیاوانی, کەوتنـە ژێـر کاریگـەریی ئـەو گەنجینـەی ڕازو نیـازەوە, شـیری ویسـتی خۆیـان بەشـەکری خۆشـبەختی ئـەو زاتـە شـیرین کـرد . مـاوەی نزیکـەی (2)سـاڵ بـەم شـێوەیە, بەوانەوتنـەوەو حـەلکردنی مـەنتوق و مـەفهوم سـەرقاڵ بـوو, وگـەورە پیـاوانی ئـەو دەڤـەرە , بـەپێی ئـەم دێـڕە شـیعرە , دانیـان بەگەورەیی ئەو زاتەدا دەنا :

| | |
|---|---|
| بلبلی زینجا برفت و باز گشت | بهر صید این معانی باز گشت |

ئەگەرچـی ئـەو خـۆرەی فەلـەکی ئامـادەگی و بـەهرەداری و خـۆری ئاسمانی شەرەف و خۆشبەختی , لەو پەڕی شکۆمەندی و ئیعتباردا بووەو , لەهونەرکاری زانست و بەرزیدا, وەکو خـۆری گەرمـەی نیوەڕۆ ڕوون و ئاشکرا بوو, زانایـان و پیـاو چاکانی ئـەو دەڤـەرە , بـە نهێنـی و بە راشکاوی, باس و ستایشی مەولانایان دەکردو خولیـای ئـەو بوون و فـەرمانڕەوایان و کـار بەدەسـتان , فەرمانـەکانی ئـەویان وەکـو گـوارە [illegible] چاو [illegible]

| | |
|---|---|
| کی بود یارب کـــه دل فارغ زدرد انتظار | قاصـد یـار آیـد وآرد بمـن پیغـام یــــار |
| جان دهم درمژدگانی دل سپارم پیشکش | روحـم سـوی دیـار یـار خـود دیوانـه وار |



بـەدیهاتنی ئـەو بەڵێنـە کـە پۆستەچـی رەبـانی لـە کەعبـەی پـیرۆزدا , مژدەی پێدابوو :

تا ئەوەی لەساڵی 1224 دا, لەپڕ مژدەهێنـەری شادی و پیاوێکی نـورانی و سـیما کـراوە, ئـەمیرێك لـە سـیپاڵی پیـاوێکی هـەژارداو زانایەکی بیناو ئاگا وەکو مانگێك لە پـەردەی هـەوردا , دەروێشـێك بـە نـاوی محەمـەد , لەلایـەن شـای پایەبـەرزو شـکۆی ئـایین و پـەنای شەریعەت و هێزو بازووی تەریقەت , گەیشت :

| | |
|---|---|
| قطب حـق غوث الوری قیّوم دین | شاهبــــاز مسند حق الیقین |
| شاه عبدالله شاه دهـــــــلوی | آنکــــەگلزار حقیقت راتوی |
| آفتاب مشرق عــــــــزّو شرف | تیر اورا جان مشتاقان هـدف |
| بشمع جمع اولیـاو اصفیـــــا | نور او کاشانهٔ دل راضیــــا |
| گرنویسم نعت آن صدر کــــرام | صد قیامت بگذرد وآن ناتمام |

خـودا رازداری بکـات و لـە چـاکەی بێبـەریمان نـەکات تـارۆژی قیامـەت, رووی لـە شـاری سلێمانی کـردووە و ئەختـەری خۆشـبەختی کـە گوزارشـت لـە خـۆری ئاسمـانی ویلایـەت دەکـات و بیرەوەریـی هـەڵهاتنی دیمـەنی حـەزرەتی مـەولانای ئێمـە, خـودا رازداری بکـات, لـەوێوە کـە ئاوێتـە بـوونی روحـانی لەگـەڵ سـەرکاروانی رازو ماناکانـدا هەبووەو بەحوکمی ئەوەی جوتیاری قـەزا, تـۆوی هـۆگریی لـە کێڵگـەی دڵدا چاندووە, بەناچارییەوە بە گەیشتنی ئەو دۆستە ئازیزەو شنەی

بای ئەو پۆستەچییە رۆحانییە, وەکو خونچە گەشایەوەو دیدەی دڵی پڕ لەنور بوو , وبۆنو بەرامە شامی داگرت . بولبولی میسال بەئومێدی دیـدار, نـاوەرۆکی ئـەم چـەند دێـرە شـیعرەی , بـەدەم سـۆزکردنەوە دەگوتەوە:

بوی جـان است زجانان کەبمن مـی آید　　یانسیمی است زصحرای خاتن می آید
یانەاینست ونەآن این نفس رحمانی است　　کـــــەبمن بی دهن ازطرف یمن می‌آید
نفس قـــاصد یاراست دراین مرزودیا　　که چنین بوی خوش ازسوی چمن می‌آید



دوای چێژ وەرگرتن لەشەربەتی ئەو دۆستی گیانانە, وبۆنکردنی بـۆنی هـۆگریی ئـەو پۆسـتەبەری مـژدەی رۆحـانی , لەبـەر ئـەوەی ئەونیشـانەو هێمایانـەی کـە ئاگابـەرزەکان و وەرگێـڕی چـاودێریی رێنموونی خوداوەندیی رایگەیانـدو ئاوێنـەی روومـەتی ئـەو دەروێشـە کەوتە روو, دووبارە خولیای گەشت بەرەو هیندستان بوو :

بلبل جان یاد هندستان فتاد　　بلبل دل را غم بستان فتاد
درنیستان وجـــــودش آتشی　　درفتاد وباز دردستان فتاد

بەناچارییەوە, بەلەخۆبوونەوەو خۆبەگەورەنەزانینەوە, رووی کردە ئەو دەروێشە بیر پاکو قسەخۆشو قسە زانە, بەسۆزەوە, ناوەرۆکی ئەم دوودێرە شیعرەی گوت :

مرحبا یا مجتبی یامنتقی　　ازکجا می آئی ای شیرین لقا



یافرشتۀ آسمانی یـاپری　　کاینچنین زیباو نیکو نظری

دەروێشی قسە شیرینیش لە وەڵامی ئەو عاشقە بەئەزموونەدا, ئـەم شیعرەی بەسەر زماندا هات :

طوطی هندوستانم بلبلی زان بوستانم　　من یکی ازدوستانم نیستم بیگانۀ تو
عاشق و رند وخرابم دردمند ودل کبابم　　گشتە دل پرخون وتابم ازغم جانانۀ تو

لەبەر ئەوەی مەولانای عاشق, دەروێشی پڕنیاز و جۆشو خرۆشی بەرازداری خۆی زانی, بولبولی دڵی کەوتە جۆشو فەرمووی :

گفت درجـــــانم فتادە آتشی　　عشق شوخی لاابالی سرکشی
سالـــــها افتادەام دردام او　　طـــرفەتر اینکە ندانم نام او
گشتەچون پروانە ناپروای او　　مـــن ندانم مسکن وماوای او

دەروێشـی مژدەهێنـەر هەرکەئەو چـەند دێـرە شیعرەی لـەو شـەیدا دڵە بیست, بەرِووی مژدەو مزگێنییەوە , ئاماژەی بەکەعبەی مەبەستی کرد :

ای رند شە بخـانۀعشق　　ای دل شدۀ ترانۀ عشق
من نام نگار مهوشـت را　　داروی دل بـــلاکشت را
میدانم ولیکنم اشـــارت　　خواهم زتو مژدۀ بشارت

ئـەو شـابازە بـەرزە فـڕە کـەتۆ نێچـیری ئـەوی , وئـەو شـەهریارەی پاڵپشتی توانایانـە, کـە خولیـای دیـداری ئـەوی, شـایەکە کەویلایـەتی

(وەلی) هندستان پاڵپشتی شکۆمەندییەتی,ومانگێکە کە هەڵهاتنی زێباییوجەمالی لەو دەڤەرەدایە :

نام أن شهباز اوج لامکان … شاه عبدالله ماه برج جـان
شد ارم شهرجان آباد ازو … بلكه ملك اين جهاد آباد ازو
گرببیوندی بشاه دهلوی … مـــــزرع امید توبابد نوی

وفەرمووی منیش هێمایەکی وەکو مزگێنیم بەرگویٚ کەوت, بەوەی کەسێکی وەکو تۆ دەگات لە داخوازیی بریسکەی ئەستێرەیەك لە کەندەڵانی ئەیمەندا, لەو درەختە پاكو پیرۆزە , وتا ئێستا کەسێکم بەو جوانیو سیفەتانەوە نەدیوە, تۆ نەبێت :



اگر بامن بیائی شاه گردی … کنون گر اخترستی ماه گردی

ئەگەر دەست بدەیتە ئەم کارە مەترسیدارە , ئەوا من ئەرکی خزمەتکردنت لە ئەستۆ دەگرم لەو رێگەیەدا و بەدڵو بە گیان لە خزمەتتدا دەبم :

هین بیا بامن کـه اقبالت رسید … مــــوسم انجام آمالت رسید
شاه از بهرتو بنهاداست خوان … مطرب وبزم ومغنّی بذله خوان
محمل رحلت ببندای ساربان کز شوق یار … می‌کشدهردم برویم قطره‌های خون قطار
زودتر آهنگ ره‌کن کآرزروی اومرا … برده‌است از دیده‌خواب , ازسینه صبر از دل قرار
کرده, ده‌منزل یکی یاسرنهم در راه‌دوست ولْزا یاکشم دردیده خاك آستانش سرمه‌داری
ﻧ جه‌ ی



بوو, بۆنی بەهەشتی رۆحی لەوپۆستەبەرەی خۆی بەمزگێنی وەرگرتبوو ودیدەی دڵی رۆشن کردبوو, بیٚمەی دڵی کەوتبووە لیٚدان و ناوەرۆکی ئەم سروودەی, بە شێوەیەکی عاشقانە دەگوتەوە :

بەناچارییەوە پشتێنی هیممەتی بەستو بەسەرباری شەوق و سۆزەوە دانیشت و لەهەوڵی بەدەستهێنانی ئیجتیهادو سامانو شایستەییو توانایيو لێهاتووییدا, بووبەهاودەمی کاروانی سۆزو هۆرەو نیازو گریانو ناڵە, لەگەڵ دەرویٚشی خۆشبەختیدا , بەرەو هندستان بەڕیٚ کەوت وسەروەتو سامانو پایەو پۆستی وەلاوەناو ئازادو رەهاو تەنیاو دوور لە خزمو ئاشناو بیگانە, وبەم سرووده بەنیازەوە , تیری دەنا بە لۆمەی خزمو بێگانەوە :

خسته جانم سوی جـانـان میروم … دردمـــندم سوی درمـان میروم
خون فشان دامن کشان دیوانه وار … گـــاه گریان گاه خندان میروم
بر خمارم , شیرو مستم سرخوشم … پای کوبان دست افشان میروم
پیش شمعی میروم پـروانـــەوش … بلبلــــم سوی گـلستان میروم
هـمچومرغی کــــز قفس آزاد شد … یـاچـو طفلی ازدبستان میروم
قصّەکـوته یوسف گـــم گشته ام … بــــاز سوی پیر کنعان میروم

مەولانای شەیدای عیشقی خودایی و ئەو پاشای بێسوپایە , ئەو شابازە بەرزە فڕە, تاکو تەنیا و بێ هاوتایە بە هەژاری و بەتەنیایی رووی لە هندستان کرد, لە ساڵی 1224و بەپشت و پەنای خوداوە رووی لە ئازەربایجان کرد .

(دوای دوولاپەڕە, کە نووسینەکانیان کاڵ بۆتەوە , دەڵێت): خۆم گەیاندە زیارەتی مەزاری پاکی حەزرەتی ئیمامی پیاو چاکان و سوڵتانی عارفان و پازەی گەیشتووەکان و زوبدەی عاشقان و راگری

.یارب بحق تربت سلطان بایزید — یارب بقاطعیت برهان بایزید
یارب بآشیانهٔ شهباز لامکان — یعنی بقرب ومنزلت جان بایزید
یارب بحق وسعت آن مشرب کریم — یارب بەتشنگی فراوان بایزید
یارب بنور سینهٔ آن پیرنیك بخت — یارب بنور مشعل ایمان بایزید
یارب به هردوسلسله ازحضرت رسول — تاجعفر از اعاظم پیران بایزید
از حضرت غلامعلی تا ببو الحسن — یکیك بحق جمله مریدان بایزید
بر خالد شکستهٔ بیچارهٔ غریب — بگشادری زمخزن عرفان بایزید
اورابجود رسان وزخودبینیش رهان ، بابکوهم شود یکی زغلامان بایزید. )

شادبۆتەوە, ولەکاتی زیارەتی ئەو مەزارەدا , ئەم قەسیدە (موناجات)ەی هۆنیوەتەوە :





دواتر بەرەو نەیشاپوور و قوقان و سەمغان بەرێ کەوت و سەبارەت بە ئەولیا پێشینەکان کەلەو شوێنانەدا بەخاك سپێردرابوون(خوداوەند نهێنییەکانیان بپارێزێت)ئاوێنەی دڵی خۆی لەهەر دڵتەنگییەك پاك دەکردەوە, تاگەیشتە توس (مەشهەد)کەمەزاری ئیمام رەزای تێدایە :

شهریار مسند قرب و رضا — نور چشم مصطفی ومرتضی

دوای زیارەتی مەزاری پاکی ئەو زاتە ئاگایە, قەسیدەیەکی هۆنیوەتەوە سەبارەت بەو خۆری رۆژهەڵاتی ویلایەتە(کەپێشتر چەند دێڕێکمان لەو شیعرەی تۆمار کردووە) .لەوێشەوە بەرێ کەوتووەو ئاوەدانی و بیابانی بڕیوەو لە مردوان و زیندوانی ئەو دەڤەرە , لەهەر گۆزەیەك قومێکی نۆشیوە .دەگێڕنەوە کە لەیەکێك لەشارەکانی خۆراساندا , لە کۆڕێکدا کە وەکو پەروانە لە دەوری ئەو شەمعە کۆببونەوە , وەکو خوویەکی خۆی پرسیویەتی : ئایا لەم شارەی ئێوەدا , زانایان پیاو چاکێك کە بەزانست و کاری چاکە ناسراوبێت دەست دەکەوێت ؟ تاوەکو چەند ساتێك بەوتەی بەنرخی, ژەنگ و تەڵخی ئاوێنەی دڵمان رابماڵێن و بەشنەی هۆگریی و هاودەمیی ئەو, خونچەی بیرەوەرییەکانمان شکۆفە بکات . ناوی پیاوێکیان بردو سیفەتە باشەکانیان ژمارد . حەزرەتی مەولاناش رووی کردۆتە دەروێشە هاودەمەکەی و فەرموویەتی : تۆ چی دەڵێیت ؟ بۆ خزمەتی بڕۆین یان داوای خۆمان نەکەین بەئەرك بەسەریەوەو کاتی نەگرین ؟

لەوێوە کەدەروێش ترسی ئەوەی هەبوو مەبادا ئەو کەسە, کاریگەریی هەبێت و سەرنجی مەولانا بۆ لای خۆی ڕابکێشێت , بەپێی ئەم دێڕە شیعرە کە :

غیرتم برتۆ چنانست اگردست دهد   نگذارم که درآئی بخیال دیگری

حەزی نەدەکرد چاوی بەکەسێکی وەها بکەوێت کە نەخواستە دڵی بگۆڕێت . لەوەڵامی گەوهەری نایابدا گوتی: تۆ خۆت کەپاشای مەملەکەتی زانستو مەعریفەی , چ پێویستت بەوەیە لەگەڵ سواڵکەرێکی بێ سەرو پێدا, گفتو گۆ بکەیت.

لەرێگەماندا بەرەو هەرات, تووشی پیاو چاکێك بووین, بەدەم
72
ڕێگەوە لێم پرسی :

که پاکیزه گو ای‌هراز کجائی   کەدارای این همه گوهر فشانی

گوتی نامۆیەکم خەڵکی هەرات, زیارەتی ماڵی خوداو مەزاری پێغەمبەرم کردو بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆم , ئاوەدانی وبیابانی زۆرم تەی‌کرد , تا گەیشتومەتە ئێرە . بولبولی دڵم ئارەزووی فڕینی بەرەو گوڵزاری نیشتمانە. وقومری شەوقم بۆ ئەو ناوچەیە دەخوێنێت , ساڵەهای ساڵە ئارەزووی ئەوەم بووەو تۆوی ئەو ئارەزووەم لە کێڵگەی سینگمدا چاندووە کە لەمرواریيەکانی دیوانی حەزرەتی ئیمام مەولانای پایەبەرز زیائولحەق شێخ خالید (خودا ڕازی بپارێزێت ) مرواریيەکم دەست کەوتووە کە کردم بە هاودەمی ڕێگای دوورم , کە دەگەمە زێدی خۆم بەو مرواریيە لەگەڵ دۆستانمدا



دەیخوێنینەوە, ئەگەر دەتوانیت یەك دوو سەعات نوسخەیەك لە دیوانەکەیم بدەیتێ, مەمنونت دەبم. بەندەش لەو کەسەم پرسی : ڕاستی , تۆ مەولانا چۆن دەناسی؟ ئەو پیاوە بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

زچشم من بپرس احوال گردون   کەشب تاروز اخترمی‌شمارم

دانیشتوانی ئەم دەڤەرە, بەهای ئەو گەوهەری دەریای مانایە نازانن, هەر وەکو دەڵێن :

هرکس ازظن خودشد یارمن   از درون من نجست اسرار من

زۆرینە سەبارەت بەگەورەیی ئەو لەوەهمو گومانـدان, سوپاسگوزارانی ئەو زاتە لەشاری هەرات, بەرۆژو بەشەو , هەردەم ناویان لەسەر زارە, بەتایبەتی زانایانو گەورەپیاوانی ئەو دەڤەرە, بوون بە بولبولی ئەو گوڵزاری عیرفانە, چونکە قومری دڵبەندی ئەو مەڵبەندەی بڕواو هەستن :

قصّه کوته مهررا هر ذرّه نبود مشتری   قدر زر زرگرشناسد قدر جوهر جوهری

شێوازێك کە بەلای زانایانی ئەو سەردەمەی هەراتەوە باوبوو, ئەوەبوو کەبەڕۆژ لە مزگەوتی گەورەی شار کۆڕیان دەبەستو , هەریەکە لە هونەروەرانی زانست, بەرامبەر بەهاوکاری خۆی دەستی

دەکرد بە گفتو گۆو مشتومڕ, ڕۆژێکیان کە کۆڕمان گەرم بوو, لەپڕ بینیمان :

نیک مردی فاضلی پر مایەای　　آفتابی درمیان سایــەای
بلکـــە مهری دردرون ذرّەای　　شیر نر درپوستین برّەای

ئەو پایە بەرزە هاتە ڕیـزی کۆری زانایانەوەو هەر بەگەیشتنی , کۆڕەکـــە وەرچـــەرخانێکی بـــەخۆوە بینـــی : دوای ســـڵاو کـــردن و بەشێوازی گەورەپیاوان, سڵاوکردن دوایی قسەکردن . قەدو باڵای بەرزی بەرامبەر بەخاکی زەوی چەوتایەوەو لەریزی دواوەی ئەڵقەی دانیشتوان, بەرێزەوە دانیشتن :



بود درسیماش فرّ سروری　　خوش فروزن همچو ماه ومشتری

لەهەیبەتی سیمای مەولانا, کۆڕەکە سام گرتی , هەرکەسەو لە شوێنی خۆیدا بەجوانی و شکۆمەندیی ئەو زاتەدا ئەبڵەق بوو, دوای وەڵامی سڵاو وپێشوازییکردن, هەموو بەپێی ناوەڕۆکی ئەم دوو دێڕە شیعرە, پرسیاریان ئاراستە کرد :

توای لؤلؤی لالا ازچـــــە بحـــری　　تـــوای پاکیزە گوهر ازچەکانی
چنین خوش صورت وشیرین شمایل　　تـو خضری یافرشتۀ آسمانی

گوتی, پیاوێکی نامۆی دەڤەری عیراق و ڕۆمەو ڕێگەم کەتۆتە ئەم ناوچەیەو وێڵی ئەو رزقەم کەلەناوچەوانمدا نووسراوە,پرسییان ئایا

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

لەزانستدا بەهرەمەندی, گوتی: کەمتازۆر, پرسییان لە چ بوارێکدا شارەزایت, گوتی لەهەر بوارێکدا بەپێی توانایی خۆم. لە نەحووسەرف وماناو بەیان, پرسییان, وەڵامی دانەوە, هەندێ لەبواری مەنتیق و ئاداب و کەلام و حیکمەت , پرسیارییان کرد وەڵامی دانەوە , هەندێ لە ئوسوڵی فیقە و ئوسوڵی ئایین پرسیاریان کرد وەڵامیدانەوەو گوتی: کەمتر لە بواری حیساب و هەیئەت و زانستەکانی بیرکاری. دواتر کە دەرکەوت لەهەر بوارێکدا و لەهەر زانستێکدا کارامەیە, کۆمەکی لە : (من لدن حکیم علیم) وەردەگرت :

طرفە نهریست پراز آب علوم　　بلکە بحریست لبالب زحکم

بۆیە بەرێزەوە پێشوازییان لێکرد و بەلەخۆبوونەوە , هەرکەسە بەشادییەوە ئامادەیی خۆی بۆ خزمەتکردنی رادەگەیاندو بەم سروودە بە شانو باڵیدا هەڵیان دەدا :

ای لقای تو جــــواب سؤال　　مشکل از توحل شود بی قیل وقال

بەڵام سفرەی وتوویژ دەپێچرایەوەو لەشەپۆلە خرۆشانەکانی مەعریفە , لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی هەتاو, سوپای ئەستێرەکان جگە لەبەر چاو ون بوون, چارەیەکی تریان نەدەبوو:

گفتن بر خورشید کەمن چشمۀ نورم　　دانند بزرگان کە سزاوار سها نیست

هەر گرێو گرفتێکیان هەبوو لە ڕێگەی مەولانا , سەرپەرشتیاری کۆڕی زانستو عیرفانەوە, چارەسەر کران و بەپلەی روونکردنەوە

گەیشتن, بەو جۆرە بۆ ماوەی چەند رۆژێك ئەو, کەرنەڤاڵی شاری هەراتی بەنوری خۆی رووناك کردەوەو دواتر بەمەبەستی ماڵئاوایی خۆی ئامادە کردو زانایان و گەورەپیاوانی هەرات, تاچەند میلێك ئەو زاتەیان بەرەو شاری قەندەهار بەڕێ کرد.

بسکە مافاتحۀ وحرزیمانی خواندیم     درپیش سورۀ اخلاص دمیدیم وبرفت

وهەر لەو رۆژەوە, بولبولی دڵی ئەو زاتە پڕ لەنیازەو بەڵکو تەواوی دانیشتوانی هەرات , لەشنەی ئەو گوڵشەنەی رازدا , لەبزاوتدان , ئەو زاتە کەهەڵگری پەرچەمی رەهایی و ئازادی, دۆڵ بە دۆڵ رێگەی تەی دەکرد و بەشارەکانی غەزنەو کابول و قەندەهارو .. هتد دا گوزەری دەکرد. کەگەڵێ جار , بەم دێرە شیعرە لەگەڵ خۆیدا دەکەوتە گفتو گۆوە :



خالد اگر نیستی دیوانۀ صحرا نورد     توکجا وکابل وغزنین وخاك قندهار

لە زمانی ئەو زاتە موبارەکەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی , هەر کە گەیشتینە شاری قەندەهار, ولەدانیشتوانی ئەو دەڤەرەمان پرسی, سەبارەت بەرێگەی هندستان, گوتیان رێگەی پەڕینەوە بەتەواوی بەستراوەو چاو ساغ ویاوەری رێگە وکاروانی جێگەی موتمانە مەیسەر نابێت, لەقەندەهارەوە تا سەرمەرزی هندستان دوومانگ رێگەیە و مەترسی و نەخۆشی هێندە زۆرە , کە تەنیا باسکردنیشی هەستی مرۆڤ بریندار دەکات , دەبوا چاوەڕێ بکاتو بەپێی (ولا تلقو

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

بایدیکم الی التهلکة)کار بکرێت, خۆیان نەخەنە دۆخێکی هاتو نەهاتەوە : من خۆم کڵپەیەك لە دڵمدا بوو کە بواری چاوەڕێ کردنی نەدەدام و ئامۆژگاریی شارەزایانم پشت گوێ دەخست و گوتم ئەوەی ئێوە دەیڵێن لەدەستدانی سەرە :

بەامید سرخود پای منە دررەعشق     کاندرین مرحلە سرباختن اوّل قدم است

هاورێیانم واتە دەروێش محەمەد و حاجی عەبدورەحمانیش گوتیان , ئەوەزی ئەو دۆڵە خوێنخوارەمان نییە, دان بەخۆتدا بگرە, بەڵکو بەخواستی خودا رێگەیەك پەیدا ببێت و بەبێوەی رەتبین .

نهی لاتلقو بایدی راز قرآن گوش دار     رفتن این وادی خون خوار درخاطر میار

منیش لە وەڵامیاندا دەمگوت :

ای حریفان من سمندر واربا آتش خوشم     نسـل ابراهیمم وگلزار باشد آتشـــــم
زآتش نمرود اگر سوزان بود نبود هراس     خوی آتش برگرفتست این دل پرآتشم

بەرێکەوت لەو رۆژانەدا کاروانچییان بەرەو هند دەڕۆیشتن, منیش بڕیارم دا لەگەڵیاندا بڕۆم , ئەگەرچی هاوڕێکانم هەوڵیان دا پەشیمان ببمەوە, بەڵام رازی نەبووم, ئەو کاتە بڕی (3)هەزار قروش نەختو سێ ئەسپم هەبوو, هەموویم کرد بە(3)بەشەوە , بەشێکم بۆ خۆم

هـەڵگرتو دووبەشـەكەی تـرم بـۆ ئـەوان بەجیٚهێشـت , خواحـافیزیم لێكردن تا لەگەڵ كاروانچییاندا بكەومەریٚو لەبەر خۆوە دەمگوت :

رشتهٔ درگردنم افكنده دوست          می كشد هرجاكه خاطر خواه اوست

بـەڵام كـاتیٚ هاوڕێكـانم زانییـان مـن هـەر سـوورم لەسـەر ڕۆیشـتن‌و زنجـیرەی دڵبەنـدیم بـەهێزە , وهـیچ هێزێـك نامگێڕێتـەوە و نییـە لـەو دۆڵ‌و كەندەڵانە ترسناكەدا باكی لەناوچوونم, ئەوانیش ناچار بوون ڕەزامەنـدیی خۆیـان رابگەیـەنن و لەگەڵمـدا بكەونـە ریٚ و خۆیـان لـەو دۆڵــە خوێنخــۆرە بــدەن, ومــاوەی (40)ڕۆژ پشــت بــەخودا, لەگــەڵ كاروانچییاندا درێژەمان بە ڕۆیشتن دا.

هـەروەها لـەو زاتـە پاكـە دەگێڕنـەوە كـە فەرموویـەتی , لـە دۆڵێكـدا كەگەڵیٚ ترسناك بوو, من ئەسپەكەی خۆمم دەڕەتان‌و عارەقەی ڕەش‌و شینی دەردەداو منیش لەخۆشی گەیشتن بەشوێنی خۆم, ئاهو ناڵـەم دەگەیشتە ئاسمان‌و جاروبار لەبەر ماندووبوون دەوەستا و ئارەزووی مـن ئـەوەبوو, دەهــەنگاو بكـەم بەهــەنگاوێك‌و هەرچـی زووتـرە ئـەو مەودایـە بـبڕم .ئەسـپەكە بـەئارەزووی ئـەوەی كەسـاتیٚ بوەسـتێن‌و ئاهێكی بەبەردا بێتـەوە, سـەیرم كـرد ئەسـپی بەسـتەزمان هاتـە زمـان‌و بەزمانێكی پـاراو پێـی گـوتم: خـۆمن دوا مـەخلوقی خـودا نـیم , بۆچـی بـەزەییت بەمنـدا نایاتـەوە, ڕێگـە نـادەی پشـوویەك بـدەم, لەوەڵامیـدا گـوتم: بۆچـی لـەمن دەپرسـی, لـەو كەسـە بپرسـە كـە ئـاگری عیشـقی





لەدڵمـدا بـەرپاكردووەو ئـەم جـۆش‌و خرۆشـەی سـۆزی لەجەسـتەمدا هەڵگیرساندووەو پووش‌و پەڵاشی ئۆقرە گرتنمی سووتاندووە[1] :

درجان وتنم فتاده شوری          افـروخته در دلم تنوری
معــــــذروم اگرندارم آرام          دردام فتادەام بناكـــام
افتـــاده بگردنم نكندی          از طرّهٔ شوخ سر بلندی

وفـەرمووی , لـەم كاتـەدا كـەدڵ ڕاراو لـەدۆخێكی پەرێشـاندا بـوو, پـووش‌و پەڵاشـی سـەبرو ئۆقرە لـەناو ئـاگری جۆش‌و خرۆشدا بـوو . لەسرووشەوە ئەم مزگێنییەم بەرگویٚ كەوت, بەرادەیـەك كـە سـەرتاپای گرتم : من لم یخرق العـادة لم یخـرق لـه العـادة . واتـە ئـەوەی سـنووری كارە ئاساییەكان نەبەزێنێت (پەڕجو نەخوڵقێنێت), ئـەو سنوورەی بـۆ نابەزێنرێت.

دەگێڕنــەوە كــە زمانحــاڵی رازی حــەزرەتی حــەق , دوای بڕینـــی هەورازو نشێوو ڕێگەی هاتو نەهات, گەیشتە شارۆچكەی (وارشیاور) وەكــو كــاری هــەردەمی خــۆی, چــاوی بــەزانایانی ئــەو ناوچــەیە دەكەوێت‌و زانایان لـەرووی خـۆ بەگـەورەزانین و دەعیـەو مشـتومڕەوە, دێنەمەیـدان و گفتوگـۆو مشـتومڕ كـردن جـۆش دەسـتێنێت ودەهـۆڵی قسەو باس لێدەدەن , دووبارە ئەو قسـە زانـی مەعریفەیـە, موسـا ئاسـا دەسـتی پـاكی ڕەوانبێـژی و پـاراوی لـە باخـەڵی بـەهرە دەردەهێنێـت ,

1- ئەم دەستەواژە شاعیرانانە, تایبەتن بەبیری مەلاحامید, نەك بەمەولانا خالید

تاوەکو ئەو گروپە, یەکە یەکە دان بەتوانایی و بلیمەتی ئەو زاتە دا بنێن و هەریەکە دان بەلاوازیی و ناتوانایی خۆیاندا بنێن :

بلی هرجا شود مهر آشکارا        سهارا جزنهان بودن چەیارا

لەزاری ئەو زاتەوە دەگێڕنەوە: لەشارۆچکەیەکی وڵاتی هیندستاندا, چوومە خزمەتی دەروێشێك و چێژم لە شێوازی گفتوگۆی شیرینی وەرگرت وسەبارەت بەدەروون بەختی هەبوو, وتۆوی ڕێنموونی لە دڵی داواکارانی خۆشبەختیدا دەچاند, داوای لێکردم کەخۆم بەدەستی ئەو بسپێرمو بایەخ بەکارم بدات, وبڕێك لەو سەرمایە دەروونییەی خۆیم پێ بسپێرێت , ئەگەرچی دڵی من ,کەسێکی تر ڕفاندبووی وموسای ڕۆحم خوازیاری بریسکەی دڵێکی تر بوو, بەڵام دۆش دامام و دەروازەی دڵی خۆمم, بەرامبەر بەسەفای دەروونی کردەوە . بایەخێکی پێدام کە بڕێکی کەمی بەئەندازەی خۆمم بینی و لە شەربەتی سەفای دەروونی شتێکم چەشتو دیدەی دڵم کردەوە , شەو کە بولبولی ڕۆح لەقەفەسی ئەم جیهانی مەجازە , بەرەو جیهانی راستەقینە دای لەشەقەی باڵ ودەرگای ئەم جیهانەی داخستو دەروازەی ئەو جیهانەی ئاوەڵاکرد , بینیم کە حەزرەتی شای ئایین پەنا, دەرکەوت وزمانی پاکی کەگوزارشتی لەرازی حەقی باڵا دەکرد, هاتە گۆو فەرمووی, کە ئەگەر گریمان بەخزمەتی جونەیدی سەردەمیش بگەیت, رازی نابم کەسەرت دابگریتو نەکەی خۆت بەدەستی کەسێکی تر بسپێریت :



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

غیرتم برتو چنان است اگردست    دهد    نگذارم کە درآیی بخیال دگری

وفەرموویەتی, کە لەشارۆچکەی لاهوردا ڕەت بووین, جەنابی موتەوەکل عەبدڵلا پیرو ئیمامی شاهی ئایین پەنا, مەولانا(خودا هەردووکیان رازدار بکات)لە شارۆچکەیەکدا, سەرقاڵی ڕێنموونی خوا پەرستان بوو, لەوپەڕی گەورەیی وڕێزدا بوو, بەخزمەتی گەیشتم , وهەرکەگەیشتمە (دار النیران)کە بنکەی ئەو زاتە گەورەیە بوو, پرسیاری ئەو زاتەم کرد, خادمی حوجرەکە رووی کردە منو گوتی, دەچیتە خزمەتی جونەیدی سەردەم , فەرموو ئێستا لە حوجرەکەدا دانیشتووە و لەخزمەتی حەزرەتی یەزدانداییە , دەرکەوت کە ئەو خادیمە ئاگاداری رووداوەکەی من بووە .هەر کەبەخزمەتی ئەو مەولایانە گەیشتم, ئەلحەق پیاوێکی زاناو پڕمەعریفە بوو, هەر بەوخووەی کردبووم بە پیشەی خۆم, رووی ناتوانایی خۆم بەرزنەکردەوەو داواکاری نزاو تکای ئەو زاتە پاکە بوومو , ئەویش تکای بۆ کردمو گەلێ بەنەرمو نیانی لەگەڵمدا هەڵسوکەوتی کرد, مەبەستی ئەو زاتە ئەوە بوو کە منیش ببم بە دەروێشی ئەو زاتەو ئەڵقەی ویستی ئەو لە گەردن بکەمو چیتر گەڕیدەی بیابان نەبمو ئەم شارو ئەو شار نەکەم , وجۆشو خروشێکی سەیرو دڵبەندییەکی تایبەت لەمندا سەریهەڵدا :

بجانم دلبری ماواگرفتە است        مرا ازهر خیالی واگرفتە است

پێم ڕاگەیاند کەمنی بولبول، شەیدای گوڵێکم و قومری شەوقم خولیای درەختی شمشادێکە کە حەزرەتی دەهلەوییە، عیشقی ئەو شکارچییە لەگەردنم ئاڵاوە، بەربۆتە گیانم دەڵێ ئەگەر نەهات بەقژ رایکێشن و ڕۆحم هەمیشە چێژ لە پێکی عیشقی وەردەگرێت :

چـــــــــودل بادلبری آرام گیرد　　زوصل دیـگری کـی کام گیرد
نهی صد دسته ریحان پیش بلبل　　نخواهد خاطرش جزنکهت گل

ئومێدوارم کە بەڵگەکانم پەسەند بکەیت .

هەرکەداوای مۆڵەتم لێکرد، یەکسەر بەرەو ماڵەوە ڕێکەوتم، وبەخەیاڵی دڵبەری خۆم دەهۆڵی ئارەزووم لێدا، شەو لەخەومدا ئەوزاتەم بینی کەبەڕۆژ چووبوومە خزمەتی و بەدیداری خۆشبەخت ببووم، بینیم کە بەدانی وەکو گەوهەری خۆی، پێستی منی بێچارەی گرتووەو بەرەو خۆی پەلکێشم دەکات . وبەندەش ڕوومەتی خۆم لەدانی مرواری ئاسای ئەو زاتە دەرباز دەکەم، ڕۆژی دوایی چوومەوە خزمەتی و گوێبیستی پێشوازیی گەرمو گوڕیبووم ، بەبێ ئەوەی باسی خەونەکەی بۆ بکەم، ڕووی پاکی تێکردم و خونچەی دەمی بەزەردەخەنە کردەوە:

گفت:اهلا فی امـــــان ، توبرو　　بی‌مداراغم مخور دل شادشو
پیش آن شیخ وصدیق داورم 82شاه عبدالله پیر محتــــــرم
می گشاید زان کلید معـرفت　　قفل مشکلهات ای والاصفت



هەر کە ئەو قسانەم لەو پیرە پڕەوە بیست کەوەکو مزگێنی، ئەو گەوهەرانەی گوارە ئاسا کردە گوێی هۆش و بیرم، بەناچارییەوە و بەجۆش وخرۆشێکی فراوانتر موتمانەیەکی ڕاستگۆیانەترو پشت

بازروم تابهند گرفتیم جـــــان بکف　　بهر نثـــار مرقد شه بـوعلی شرف
وبروی قسم بجـــــان عزیز مبارزش　　کاندر وفاش کرده جوانی خود تلف
هست این غلام رابدرش حاجتی عظیم　　لطفی کند وبـاز رهانندش از اسف
باشد درآستانش امید استطاعتی　　درحضرتیکه یافت ازوهند صد شرف
یمضي علی الفلاح مـن العمر مامضی　　یـأوي الی الفلاح من الذنب ماسلف
شاهی بچشم خشم ببحر ار کند نگـاه　　دریــتــیـم آب شود در دل صـدف
برمـاه خواسـف ازکـرم بنگـرد گهـی　　بر روی آفتاب شمادر دو صدف کلف
بانسبت عـطاش خزف بهتراز گهر　　ویباقوه غناش گهر کمتر از خزف
درچشم اهل دیده مسمّاش همچو اسم　　آئینه ایست عـکس نمـای شەنجف
خالـد خموش هرچه توگوئی بطرز شعر　　بی‌دولتان مبـالغه دانندش وسلف

ولەم کەینو بەینەدا ، پێکەوە چەند دێڕ شیعری عاشقانە پێکەوە دەڵێنەوە . ئەو گەنجە داوادەکات کەگەوهەرێك لە گەوهەرە شاراوەکانی خۆی پێ‌ببەخشێت کە لەگەنجینەی ڕازەکانی سینگیدان وبیکات بە گوارەی گوێی. ویستی و ژەنگ و تەڵخی لە ئاوێنەی دڵی، بەوتەی پاك و بەرزی ڕامالێت، بۆیە حەزرەتی مەولانا دەڵێت :

پنجاب شد مسخّر چشمش خبر برید　　زنجید راکه بچه کتری جهان گرفت

وزیارەتی مەزاری پاکی حەزرەتی ئەبو عەلی شەرفی کردووەو ئەم چەند دەنکە مرواریيەی هۆنیوەتەوە :

دەگێڕنەوە کە یەکێك لە دڵسۆزان لەحەزرەتی مەولانا, مانای ئەم نیو دێڕە :

(( بروی قسم بجان عزیز مبارزش )) دەپرسێت, ئەویش فەرموویەتی کە :ئەبو عەلی شەرەف کەسێك بووە لە وەلییە دڵرفێنەکان, بەپێی دەرکەوتنی ناوی رواڵەتی لەگەڵ شازادەیەکی خاوەن جەمالدا کەناوی (موبارز)بووە , یەکتریان خۆشویستووە . باوکی شازادەش , مانای شازادەی شایستەی پێگەی شاهانی نەزانیوە , وبەکوڕەکەی ڕێگەی نەداوە کە هاوڕێیەتی ئەو عاشقە بکات , بەلاّم ئەو عاشقە بەهێزی دەروونی خۆی, بەجۆری شازادەی بۆلای خۆی راکێشابوو , کە هەمیشە ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو وبیٚباکانە لەتیری لۆمەی خزمو بێگانە , میانەی خۆی لەگەڵیدا نەبڕیوە , وپاشان بە چاودێرانی راگەیاندبوو کە بەهیچ جۆریٚ ڕێگە نەدەن شازادە قسە لەگەڵ ئەو عاشقەدا بکاتو دەرگای هاموشۆیان بەرووددا دابخەن, بەلاّم چاودێرەکانیش شەیدای ئەو عاشقە ببوون و تۆوی ویستی ئەو زاتەیان لە سینگدا چێنرابوو, بۆیە تەنیا ڕێگەچارەیان لەوەدا دەزانی





کە بۆ چەند ڕۆژێك , بەبیانووی شکارەوە, شازادە بۆ شوێنێکی تر دووربخەنەوە و لەرێگەی گەشتو بینینی دەشتو چیاوە لەو هۆگرییەی دووربخەنەوە , ئەو عاشقە لەئازاری دووری , هەڵدێتو ئەویش لەوەی کە دڵی زانایەکی بریندار وناخۆش کردبێت , رزگاریان دەبێت, ولەبەر ئەوەی هەردەم بەمەبەستی دووری لە نێوان ئەو دوویارەدا , ئەو کارەیان ئەنجام داوە , ئاگری سۆز لە دڵی بو عەلی شەرف بەردەبێت , وگەوهەری ئەم دێڕە شیعرەی بەسەر زماندا دێت :

یار فردا سوی صحرا میرود باصد شتاب     یاالهی تاقیامت برنیاید آفتاب

دوای ئەوەی ئەم دێڕە شیعرەی بەسەر زماندا دێت , لەشوێنێکدا کە کەس نەیبینێت خۆی حەشاردەدات , بۆ بەیانی دبینێت کەخۆر لەکونجێکی جیهانی تاریکستاندا رەنگزەردو بیٚ ئەوەزە , وهەستیان بەوە کرد کە بەلاّیەکی گەورە, بەهۆی نزای ئەو گەورەپیاوەوە روویداوە , بۆیە هەوڵیان دا , تاوەکو ئەو زاتە پەیدا بکەنو بەپاڕانەوە و نیازو گریەو ناڵە بەسەر پێیدا کەوتنو لەوەلاّمدا فەرمووی , ئەگەر خۆری من هەڵبێت ئەوا خۆریش هەڵدێت .

بەناچارییەوە شازادەیان هێنایەوەو بەدەستی ئەو پیرەیان سپارد , وهەر کەئەو عاشقە بەدیداری مەعشوقەکەی شاد بۆوە , یەکسەرە خۆریش هەڵهات .

ئیتر دەستی یەکتریان گرتو ئەو شارەیان بەجیٚهێشت و روویان لە بیابان کردو , لەئاوێنەی یەکتردا , چاویان بەجوانیی رەها کردەوە

, تائەوەی دەریای ورەی خۆشەویستی راستەقینە کەوتۆتە جۆش‌و خرۆش :

بلی سلطان معشوقان غیور است　　　زشرکت ملك و معشوقیش دور است

ئەو دوویارو یاوەرە ڕێگەیان بڕی تاگەیشتنە کەناری بیرێك و لەوێدا وەستان‌و ئەو خواردنەی پێیان بوو خواردیان و خواردنەکەیان گۆشت بوو , دوای خواردن ئەبو عەلی شەرەف ئێسقانەکانی کۆکردەوەو بەشاهزادەی گوت ئێسقانەکان بخاتە ناو بیرەکەوەو زوو بگەڕێتەوەو تەماشای ناو بیرەکە نەکات, تاوەکو بەئاگری دۆزەخ نەسووتێن .

دوای ئەوەی شازادە ئێسقانەکانی خستە بیرەکەوە , بەحوکمی ئەوەی کە (الانسان حریص علی مامنع) چاوێکی بەبیرەکەدا خشاند , ئاو لەبیرەکەوە قەڵبەزەی کردو شازادەی راپێچی خۆی کردو خنکاندی . وعاشقیش لەداخی مردنی یاری خۆشەویست و مایەی ژیانی , مردو عاشق‌و مەعشوق پێکەوە :

(فی مقعدصدق عند ملیك مقتدر ) بەدیداری خۆشەویستی راستەقینەی خۆیان شادبوونەوە (رەحمەتی خودایان لێبێت) . وهەر لەوێدا مەزاریان بۆ دروست کردن.

دەگێڕنەوە , لەو ماوەیەدا , مەولانای شەیداو سەرگەردانی بێ ئارام (خودا رازداری بکات) کە خولیای دیداری پەنای هەموان شاعەبدوڵلا بوو , بەرێزەوە بەپێی شەوق‌و بەجۆش‌و خرۆشەوە, بیابانەکانی تەی دەکردو , پێکی دڵی پڕلە بادەی شەوقی بینینی ئەو



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

قوتبە سەروەرە کردبوو , هەنووکە مەودایەك لەنێوانماندا مابوو کە زمانحاڵی ئیلهامی یەزدانی وئاوێنەی پرتەوی ئاشکراکردنی رازەکان و گوڵی گوڵزاری ئاشکراو شاراوەکان , یارانی خۆی ئاگادار کرد کەشنەبای ویستی بولبولی باخی خۆشبەختی هەڵیکردووە و فەرموویەتی ئەو شابازەی کە ئێمە بەنیازین شکاری بکەین وبەدەستی دەروونی خۆمان, لە دەهۆڵی دیداری ئەو دەدەین و بەدڵ‌و بەگیان چاوەڕوانی کاتی دیداری ئەوین , ئەوەتا خەریکە دەگات‌و سەفای ماڵەکە بەشنەی خواست‌و شەوقی ئەو بولبولە شکۆفەی کردووە :

آنکه از اسرار حق باشد خبیر　　　دیده ٔدل باشدش پاك‌و منیر
مشرق‌و مغرب بچشم اویکی است　　　چاه وخندق پیش او خوش مسلکی است
آنکه واقف باشد از اسرار هو　　　سرّ مخلوقات چەبود پیش او

وئەم بولبولەی داستانی سەرای گوڵزاری عیرفانیش , بۆنی شنەی پاکی سەرخێڵی ڕێباز کردبوو وبەدیدی ئیدراك تیشك‌و بریسکەو هێماکانی بینیبوو .

بەکورتی ئەو شاسواری مەیدانی ویست‌و ئەدەبەو ئەو سەرداری خێڵی هەوڵ‌و داخوازییە , بەواتەی :

وعده ٔ وصل چون شود نزدیك　　　آتش عشق تیز تر گردد

شەوو رۆژ وەکو گڕی ئاگری ناو کورە سوورو گەش , ماڵ بەماڵو قۆناغ بە قۆناغ شارۆچکەکانی هیندوستانی تەی دەکردو لە بەرخۆوە دەیفەرموو :

خرّم آن ساعت کەشام هجررا پایان رسد　　عاشق دل خستە ٔ مجروح را درمان رسد
زین عجایب تر نباشد درجهان افسانـە ٔ　　آفتاب جـــــودرا شب پرّە ٔ مهمان رسد

ماڵ بەماڵ توندتر لە دڵ, تاگەیشتە قەڵای شاری دەلهی کە قیبلە و کەعبەی مەبەستی بوو , وەکو خۆر لەوێدا نوری لێدەباری .
وەهەر ئەو عاشقە شەیداو بێقەرارە, بەچاوی فرمێسکاوییەوە چووەناو شاری یارو لە پێگەی ئەو زاتە پاکەوە نزیك بۆوە , بەجۆش و خرۆشەوەو بێ ئۆقرەو ناٶ بەئەقڵو هۆش , ناوەڕۆکی ئەم غەزەلەی هۆنییەوە :

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

دوای هەر پەیوەندیی و شەیدایی رەهاو تاکەکییەك, وەهەر بەرگی گومانو دوودڵی رووتو داماڵراو , ئیحرامی راستیی و ویستی پۆشیو تابلۆی یادی لەغەیری دۆست پاککردەوەو بەهاتم هاتم سەرلەبەیانی رۆژی 26ی مانگی زیلحەجەی ساڵی 1224 گەیشتە دەروازەی خانەقای حەزرەتی شای ئایین پەنا (خودا لێی رازی بێت) , وبەرێزو لەخۆبوونەوەو دانووشتانەوە , لەو دەرگای میهرەبانییەوە چووە ناو کەعبەی دڵخوازەوە .
لەبەر ئەوەی ئەو خۆرە بێگەردەو ئەو تریفە رووناکەو ئەو دەرگای بەرەکەتو خۆشبەختی ومرواریی شەرەفو ئابڕووە, بەجۆشو خرۆش و سۆزو بڕواو ویستو دڵسۆزیی وئەدەبی تەواوەوە, چووە نێو خانەقا موبارەکەکەوە, هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆنو بەرامەیەکی نوێی بەدانیشتوانی ئەو ناوچە بەهەشت ئاسایە بەخشی .

شددر ودیوار آنجا نعرە زن　　ابشروا یاقوم قد زال الحزن

جای جانانست این جامایە ٔ جانم کجاست　　منزل سلطان خوبانست سلطانم کجا است
همچومجنون کوەوهامون می نوردم بهر او　　سوبسومی جویمش امّانمی دانم کجاست
چون کواکب صف بصف خیل بتان درجلوەاند　　شاه خوبانم کجا خورشید رخشانم کجاست
سخت سرگردانم اندراین شب تاریك خو　　روشنی بخشم کجا شمع شبستانم کجاست
اشکبارم بیقرارم دردمندم دلفکار　　قرةّ العینم کجا آرام و درمانم کجاست
بلبل فصل خزانم والە وشیدای گل　　ای دریغا نوگل گلزار رضوانم کجاست
قمری بیچارەام طوق وفادر گردنم　　هرطرف کوکوزنان سروخرامانم کجاست
بازدل طرز سخن سنجی زنو آغاز کرد　　محفل آرانکتە پرداز سخن دانم کجاست
خالدا خاطر زخوبان جهان دارد ملال　　حسرتا دردا دریغا شاه خوبانم کجاست

بەدیـداری شـاه عەبـدوڵلاّی ناسـراو بـەغولام عـەلی شـاد بـۆوە . وبەسلاّمەتی بینین, شەرابی گۆزەی عاشقان , مایـەی ڕۆحی ئاسۆی نـۆش کـردو لـەخودو خۆویسـتی دابـڕا وپـردی پەیوەنـدیی هـەر ئارەزوویـەکی پچـڕاند , ئـەوەی دەبـوا بیبینێـت بینـی , ئـەوەی دەبـوا بیبیستێت بیستی , دووبارە ئیبراهیم ئاسا دابڕانو تەنیایی وبێبەری بـوون لەهـەر شـتێك, جگـە لـە کراسـێك کـەوەکو کەفـەن جەسـتەی داپۆشێت, خاوەنی هیچ نەبوو , وهـەموو بەنیازی حـەزرەتی شـای نەقشبەند (خودا ڕازداری بکات) بەسەر هەژاراندا دابەش کرد .

دەگێڕنەوە کە ئەو مانگە, موبارەك و تواناوپڕ لەزانست و بڕوایە , دوای ئـەوەی بەخزمـەتی شـاهی ئـایین پـەنا (خـودا لێـی ڕازی بێـت) گەیشت و بەئاماژەی خزمەتگوزارانی حـەزرەتی دەهلـەوی , لـە یـەکێك لـە ژوورەکـانی خانـەقا موبارەکەکـەدا نیشـتە جـێ بـوو , بـەپێی ڕێـو ڕەسـم و ڕێزگـرتن لـەو زاتـە پاکـە, تامـاوەی (3)ڕۆژ لەوێدامایـەوە وحەزرەتی شای ئایین پەنا هیچ شتێکی لـەو نەپرسی , دوای ئەوسێ ڕۆژە, بەیانی ڕۆژی دواتر یەکێك لەرازدارانی کۆری نـاردە لای مـەولانا ( خـوداڵێ ڕازیبێـت ) و چـەندئامۆژگارییەکی بـۆ ناردکـە : ئایـا کـەس هەیـە دەسـت لـەماڵ و سـامان و پلـە و پایـە هـەڵبگرێت و مـاوەی (1)ساڵ ڕێگە بپێوێت, بەمەبەستی هەوڵ و داخوازی , دەتوانێت ماوەی (3)ڕۆژ گوێ بە هیچ نـەدات و لە گۆشـەیەکدا هەڵبنیشێت ,. وبەچـەقۆ خـەیاڵی (في التـأخير آفـة)ی ژەنگـی ئەسـتووری ئاوێنـەی هـاودەمی لانـەبات, بۆچـی ئاگـاداری نـاوەڕۆکی (هلك المسّوفون) نییـەو (الوقت سيف قاطع ان لم تقطعه يقطعك) ی فەرامۆش کردووە . مەسەلەی (من





استوى يوماه فهو مغبون) لـەنێوان ڕێبـەرانی سـۆفیگەرییدا, شـتێکی باوەو پەندی (غريم لايقضى دينه) گەلێ بەناوبانگ و باوە :

هر آنكو غافل ازحق يك زمان است      درآن دم كافراست امّانهان است
اگـــرآن غافلى پيوســـته باشد      در اســـــلام بروى بسته بـاشد

ولەبـەر ئـەوەی حـەزرەتی مـەولانا (خـودا ڕازی داری بکـات) ئـەم ئامۆژگارییانەی بیست ,و چێژی ئەو وتـارەی بەلاوە پەسـەند بوو , لە وەڵامدا , بەم جۆرە ڕایگەیاندو لـە کێڵگـەی هۆمێردا تۆوی ئارەزووی بـەم جـۆرە چـاند کـە : منـی ناکامـڵ و پـڕ لـە کـەم و کـوڕی , ئـەم ڕێگـە دوورو درێژەم بە هومێدی ڕەزامەندیی ئێوەی سەرچاوەی نوور تـەی کـردووە , وئێسـتاش دیـدەی هومێـدم بەشـاڕای مزگێنییـدا دادڕیـوەو لەبـەر ئـەوەی خۆم شایستەی شـای پاڵپشت نـەزانیوە, سـەرەڕۆیانە و بەبێ مۆڵەت نەمتوانی بێمە خزمەتتان :

شاه اگر لطف بىعدد راند      بنده آن به كەحدّ خود داند

شەمشەمە کوێرەی نابینا کەی شایستەی میهری نوورو ڕووناکییە . ومەگەزی بێ سەرو پێ کەی شایستەی شکاری شابازە :

دلى چون شەمرا برداشت ازخــاك      سز دگــــر بگذرانم سرز افلاك
اگر بر رويدازتن صد زبـــــانم      چوسبزه شكر لطفش كى توانم

ئەگەرچی سەرتاپا پڕم لەکەمو کوڕی و نەزانیو نائاگایی, بەلاّم ئارەزووی پەسەند کردنی دەکەم و نیازو ئارەزووی منی نامۆ لەدەرگای خۆشبەختی پەنای مەحرەم و رازداری و غەیب , سیّبڕگەیە :

**یەکەم** : ئەوەی خاوەن قیبلە, منی هەژار وەکو غولاّم پەسەند بکات و هەرگیز بەنازناوی مەولەوی و ...هتد ناوم نەبەن و تەنیا بەناوی خۆم کە خالیدە , بانگ بکرێم و دەرگای هومێدم بەو مژدەیە ئاوەلاّ بکەم .

**دووەم** : ئەوەی سەبارەت بە خواردن و خۆراکی تری خزمەتکارانی خانەقای موبارەك , ناوی بەندە لە ناوی خەڵکی تر جیا نەکەنەوە .

**سێهەم** : ئەوەی ئەرکی خزمەتکردن لە پێشاوەکانی خانەقادام پیّ بسپێرن , وەهەر کاتیّ ئەم سیّ بڕگەیە لەلایەن بەڕێزتانەوە پەسەند کرا , ئەوە ئیتر مایەی سەربەرزیی بەندەیە .

هەر کەپەیامبەری حەزرەتی شا , وەلاّمی ئەم نیازمەندەی بارەگای خوداوەندی, بەخزمەتی گەیاندەوە , ئەو حەزرەتە بۆ ماوەیەك لە رووی لەخۆبوونەوە و خۆشکاندنەوە , سەری بەرەو گوڵزاری سینگی چەماندەوە کە پێگەی دڵنیایی و ئاراممییە . دواتر خونچەی دەمی بەشنەبای پەیڤی مەعریفە کردەوە , کەبەڵیّ بڕگەی یەکەمو دووەم پەسەندن , بەلاّم سێهەم بڕگە , حەزرەتی شای شکۆمەندو خواجەی سەرفرازی نەقشبەندە (خودا رازی بپارێزێت) , ولەبری خزمەت لە پێشاوەکان , کاری ئاو گێرانی پیّ سپاردو دەروازەی رەحمەتی, بەم شێوەیە ئاوەلاّ کرد.





مەلەوانی دەریای مەعریفەو گەنجینەی راستی, لەداهاتوودا (5)مانگ لەسەریەك, دوور لە خۆ بەزلزانی وبەرێزەوەو رەچاوکردنی ئاکاری مەولەوی یان مەولانای رووت لەخانەقای حەزرەتی شای ئایین پەنا, بەسەری رووتو پێی پەتییەوە, کاری ئاو گێڕی ئەنجام داو بەئاوەڕشێن بەبیّ ئەوەی ژەنگو تەڵخی دڵتەنگی بکات , بەناوەڕۆکی ئەم ئامۆژگارییانە دەست بەکار بوو :

تاتوانی بەندە شو سلطان مباش      سخت کش چون گوی چون چوگان مباش

نفس را میداردر حرّ فراق      تابر افروزد زنار اشتیاق

هرخسی را این تمّناکی رسد      موسی باید کە اژدها کشد

دەگێڕنەوە لە زاری ئەو حەزرەتە موبارەکەوە (رەزاو رەحمەتی خودای لێبێت) کە فەرموویەتی , ئەو بیرەی کە هەموو جاریّ من ئاوی لیّ هەڵدەکێشم , کەمیّ لەخانەقاوە دوور بوو, ئەگەرچی دوور بوو , بەلاّم هەمیشە خەڵکی لەدەور کۆ دەبۆوە , سەرەڕای ئەوەی ژنە ئاگر پەرستەکان و شوومەکان , بۆ ئەوەی ئازاری من بدەن , دەوروبەری بیرەکەیان پیس دەکرد و ئەم رەفتارەیان بۆ کات بەسەربردنی خۆیانیان دەکرد , کەدەبوا من هەموو جاریّ, دەوروبەری بیرەکەم پاك بکردایەتەوە و دواتر گۆزەکەی خۆمم پڕ دەکردو دەمخستە سەر شانم و دەمبرد بۆ خانەقا , رۆژانە چل دێزەی گەورەم پڕ لەئاو دەکرد و حەوشەی خانەقام ئاوڕشێن دەکرد, بەم شێوەیە رۆژم بەسەر دەبرد . (5)مانگی رەبەق لە بەرەبەیانەوە تا کاتی شێوان ,ئەوە کاری من بوو

کەئەم خزمەتە ببووە ئارەزووی دڵم, تارادەیەك سەرشانم بریندار ببوو , خوێنیان تیٚزابوو وخوێنیان لیٚ دەتکا ومن لەکاری خۆمدا , گەلیٚ جیددی بووم و ساتێك پشووم بەخۆم نەدەدا .

لە مەولا ئەحمەد کولە سارەیی کردستانی کەیەکێکە لە موریدەکان و پەسەندەکانی حەزرەتی مەولانای ئێمە کە مۆڵەتی لەجەنابی حەزرەتی شێخی ئێمە وەرگرتووە , بیستوومە کە دەفەرموێت : لەزاری ئەو حەزرەتە موبارەکەم بیستووەو فەرموویەتی : کاتیٚ کەمن لەخانەقای حەزرەتی شای ئایین پەنا (خودا لیٚی رازی بێت) کاری سەقاییم کرد , بەرێکەوت رۆژێکیان , بەهۆی قەرەباڵغی سەر بیرەکەوە , دوور کەوتمەوە بە دوای ئاودا, بەبیٚ ئەوەی بزانم کە ئەو شوێنە تایبەتە بە لولییەکان , چاوەڕێی هەل بووم و لەگۆشەیەکدا دانیشتبووم ولاپەڕەی دڵم لە هەر خەیاڵێك پاك کردبۆوە, جگە لەخەیاڵی دۆستمدا نەبێت , لەپڕ چاوم بە ژنێك کەوت کە کتو مت لەدایکم دەچوو , رەحمم جوڵاو دەستم بەگریان کرد , ماوەیەك گریام, دواتر سەرم نایە سەر ئەژنۆم و کەوتمە خەیاڵ و ئەندێشەوە, لەپڕ ئەو ژنە بێداری کردمەوەو گوتی لەو ماڵە بانگت دەکەن , من بەبیٚ ویستی خۆم هەستامو دوای ئەو ژنە کەوتم , رووومان لەو خانووە کرد کە ئاماژەی پێکردبوو , تاگەیشتینە شوێنێك پڕبوو لە ژنانی جوان و پەری ئاسا , هەر یەکە پاڵی بەپاڵپشتی زێڕەوە دابوو , دڵیان لە خاوەن دڵان دەفڕاند , مات بووم, وشەی گەڕانەوەم بەدڵدا هات , بەو گومانەی کە ئەو ژنانە ئاگر پەرستن کە منیان بەمەبەستی کوشتن, بۆ ئەو شوێنە بردووە . گەورەکەیان پەری رووخسارێك بوو کە دیدەی دڵ , تائێستا ئەو جوانییەی نەدیبوو ونیگار کێشیش تائێستا وەها

نیگارێکی نەکێشابوو , بەرێزەوە دایاننام , وەرگێڕێکییان هێنا کە دەمزانی پاوێکی نامۆیە , ولە سیمایدا دیاربوو کە پیاوێکی نەجیبزادەیە : ئەو ژنەی تۆی بەدەم گریانەوە بینی , باسی تۆی بۆیان کردووە , من دڵم بۆتۆ سووتا و ئاگری دڵتەنگی لە ناخی دڵمدا کڵپەی سەند . لەو رووەوە ئەو ژنەم نارد بە شوێنتدا و ئەرکی ئەوەمان خستە سەرشانت تا لێرە ئامادە ببیت . وسەبارەت زێدو نیشتمان و ئەو دۆخەی تێی کەوتووم , پرسیاریان لێکردم . دواتر بوخچەیەکیان بۆ هێنام سیپاڵ و بڕیٚ پارەی تێدا بوو . گوتی ئەوە لەمن وەربگرە , من گوتم کە ناتوانم بەبیٚ رێگە پێدانی حەزرەتی شای خاوەنی قیبلە , ئەو شتانە وەر بگرم . هومێدوارم لێم نەڕەنجێیت و رێگەم بدەن بڕۆم , بینیم کە داوای پیاوێکی کردو نامەیەکی نووسی و هێندەی نەبرد رۆیشت و گەڕایەوە و نامەیەکی حەزرەتی شای ئایینپەنای هێنابوو , دای بەدەستی منەوە , تێیدا نووسرابوو , خالید چی تۆی گەیاندە گەڕەکی لولییەکان , ئەڵبەتە هەر شتێکیان پێشکەش کردووی وەریبگرەو بەسەلامەتی خۆت رزگار بکە , منیش سیپاڵ و بڕە پارەکەم وەرگرت و گەڕامەوە .

دوای ئەوەی مانگی بورجی سەتڵ (خودارازداری بکات) بۆ خوداو لە خودادا لە خانەقای حەزرەتی شای ئایین پەنادا(خوا لێی رازی بێت)بەکاری سەقایی و ئاو گێڕی سەرقاڵ بووم وبەئاوی دڵسۆزیو ویست , تۆوێك کەکێڵگەی بەهرەدار چاندبووی , سەوزببوو, دواتر بەحوکمی (من تواضع لله رفع الله قدره) سەرنجی چاودێریی ئەزەلی , لەخاکی سووکایەتی پاراست و گەردنی هومێدی بەملوانکەی نەمری دەشەکایەوە , ئەوسا حەزرەتی شای وریاو سومبڵی میهرەبانی

خوداوەند, لەبری کاری خشتبڕین, داوای لێکرد خەریکی کاری پاککردنەوەی دڵی خۆی بێت , تاوەکو بەدووبارە کردنەوەی وشەی ناوی خودا , لەماوەیەکی کەمدا , دەلاقەی فەیزو فتوح بەرەو کۆتایی لەسەرەتاوە (اندراج النهاية في البداية) کە لەتەریقەتی بەرزی نەقشبەندیدا باوە و لە ناخی دڵ‌و ڕۆحی خۆیدا کردوویەتییەوە .



بەڵێ , ئەوەی لەعلی درەخشان لە خۆری درەوشاوە وەریدەگرێت , شایستەی بەهرەی هەر بەردو گوڵ‌و دڕك‌و داڵەو ئەوەی بولبولی هەزار داستان لەدەمی خونچەی باخ بۆنی دەکات , شایستەی هەر قاژو قەلەڕەش و مارو مێرویەك نییە :

قابل صيقل نباشد جوهری چون آيه مهر را كس نيست چون لعل نمايی مشتری

كيميارا كيمياگرشوقمند وطالب است قــدر زر زرگرشناسد قدر جوهر جوهری

بەناچارییەوە بەهەلێکی کەمەوەکەهەوێنی توانایی ئامادە بووەو خاکی بەهرەی بەئاوی ئەزەلی شێدار کردووە, سەبارەت بە زنجیرەی بەرزی نەقشبەندی کە بریتییە لە یاداشت‌و ئامادە بوونی دوور لە غەیبەو بەهرە لە ئیندراج و ئینعکاس ببینێت وبەزاخاودانی کارەکان وویستەکان و کێشمانەکان و ترپە مەعنەوییەکان, بەرەوتی موراد لە چەمکەکانی تەریقەتی نەقشبەندی روو دەکەن, وردە وردە ئاوێنەی دەروون بەسەر دەچێت , هەردەم ئاگری دەردو خواستی زیاترو پووش وپەڵاشی ئۆقرەو ئارامبوونی پڕ ئەندێشەتر بووە , تاوەکو سفرەی هەر بیرێك , جگە لە بیری دۆست کە لەگۆشت و ئێسقان و دەمارو پێستیدا هەبوو , بپێچێتەوە :



عشق آن شعله است كوچون برفروخت هرچه جز معشوق باقی‌جمله سوخت
تيغ لاقــــد قتل غير حق بــراند درنگر زان پس كـــه بعد از لاچەماند
مـــــاند الا الله وباقی جملـه رفت شادباش ای عشق بركت نور رفــت

دەگێڕنەوە: کە یەکێك لەزاناکان کە لە کەناری خانەقای حەزرەتی شای ئایین پەنا(خودالێی رازی بێت) سەرقاڵی وانە وتنەوە بوو, لەورووەوە کە زانست گەورەترین پەرژینە, لە رووی کەللە رەقییەوە, رێگەی بێزاری ودەمار گیری گرتبووە بەر , دەرگای لادان‌و دوژمنی بەرووی خۆیدا ئاوەڵا کردبوو, وبەپێی بەڵێنی : من (عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب) , ولەهەڕەشەی: (من عضّ علي ولي الله عز وجل خرب في قلبه بسهم مسموم زاهل , بێ ئاگایە . هەردەم لە بیری ئەوەدا بووە کەئەگەر کەسێکی, نامۆ یان بێ دەرەتانێك لە شوێنی خۆی ئاوارە بوو وناوبانگی حەزرەتی شای ئایین پەنای بیستبێت, بە هومێدی ئەوەی کە لەسفرەی پڕبەرەکەتی, نواڵەیەکی بەرکەوێت, خۆی پێ گەیاندووە , خۆی بەو نامۆو بێدەرەتانە ئاوارەیە گەیاندووەو بەفرتو فێڵ‌و گزی , شەیتان ئاسا , لە خشتەی بردووەو لەو خۆشبەختییە بێبەری کردووە . وحەزرەتی مەولانای ئێمە , دوای ئەوەی ئەم زانیارییانەی زانی, ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە خۆزگە لە تەنیایی‌و خەڵوەت‌و دوور لەمەحرەم و کەسانی تر , تووشی ئەو پیاوە دەبوم, تا بەکۆمەکی خودا , کارێکم بکردایە بێدەنگ ببێت‌و دەمخستە سەر رێگەی رزگار بوون . لەم سەرو بەندەدا , ئەم سەر کاروانی دەستەی بێ بڕوایانە , بە شێوەیەکی چەوت, یەکێك لەرازدارانی خۆی رادەسپێرێت تابچێتە خزمەتی حەزرەتی مەولانا لە

رووی شكۆمەندیی خۆیەوە , یەك سەعات لەگەڵ مندا بەتەنیایی دابنیشێت , ئەوا مەمنونی دەبم , بەڵكەم ئەو گرفتە ئاینییەی كە ساڵەهای ساڵە بەدەستییەوە دەناڵێنم , بەپەنجەی بەیانی ئەو زاتە كە سەرچاوەی زانستو عیرفانە, چارەسەر بكرێت و ئەم گەردو تۆزە كە لەبیرەوەریمدایە, بەسەفای دڵی ئەو زاتە پاك بێتەوە . حەزرەت فەرموویان , لەبەر ئەوەی داواكاریی ئەو پیاوەم بیست , زیاتر خولیای دیداری بووم , گوتم بەسەر چاو , ماوەیەكە منیش خولیای دیداری ئەوم .



هەر چۆن بێت, ئەو حەزرەتە ڕازی بوو كە بۆ دیداری ئەو فێڵبازە بڕوات و ئەو شوێنە نورانی بكات كەئەو دەستنیشانی كردووەو چاوەڕوانیەتی . دەڵێن , حەزرەت فەرمووی : بینیم كە ئەو پیاوە فێڵبازە لە دوورەوە دەركەوت بەجۆرێ كەبەئاشكرا دوكەڵی بێبڕوایی, وەكو دوكەڵكێشی گەرماو دچوو بەئاسماندا . من خۆم لە توانایی خۆم دوورخستەوەو پەنام بە ئەرواحی پاكی ئەو حەزراتانە بردو هیمەتو هێزی شێری پاراستنی پاك داوێنی بكەم بەقەڵغانی تیری بەلای خۆمو ڕووم كردە قیبلەی ڕەها . كابرا هاتو سڵاوی كرد , دوای وەڵامی سڵاو, بەقسەی شیرین گەلێ فێڵبازانەو بەڕواڵەت ئاشناو بەمانا بێگانە , لەهەر بوارێكدا باسێكی هێنایە پێشەوە , هەندێ لەو هێشووە ترێیەی لە دەسماڵێكدا لەگەڵ خۆیدا هێنابووی , لەبەردەم مندا داینا كە : یەكەم باپێكەوە ئەم ترێیە بخۆین, ڕێگەی ناهەموار بخەینە لاوەو ڕێگەی هۆگری بگرینەبەر , من گوتم : بەڕاستی پێویستە مامەڵە بكەین كە پێچەوانەكەی فرتو فێڵو گزی و دووزمانییە , وفرتو فێڵ و گزی شێوازی شایستەی خەڵكی دووڕووە.



مەلاحامید لەم بارەوە درێژ بڕی دەكاتو لە ئاكامدا بەو ئەنجامە دەگات كە مەولانا خالید , مەلای ناوبراو كە بڕوای بە شێخ عەبدوڵلای دەهلەوی نەبووە , ناچار كردووە تۆبە بكات و بگەڕێتەوە بۆ داواكردنی لێبوردن لە كاری رابردووی , بردویەتییە خزمەتی شێخ و شێخیش لێی بووردووە .

## چەند قەسیدەیەك لە شیعری مەولانا خالید



بمعمار غمت نوساختم ویرانهٔ خـــودرا          بیادت كعبه كردم عاقبت بتخانهٔ خـــودرا
فروماندند اطبّای جهان از چارەام آخـــر          بــدردی یافتم درمان دل دیوانهٔ خـــودرا
زسودایت چنان بدنام گشتم درهمه عالـــم          بگوش خود شنیدم هر طرف افسانهٔ خـودرا
بگرد شمع رویت بسكه گشتم تـاندم از پرواز          سرت گردم چه زیبا سوختی پروانهٔ خودرا
ادیب من جلیس من شود درحلقهٔ رنـــدان          بگوشش گر رسانم نالهٔ مـستانهٔ خودرا
دراقلیم محبّت از خـــرابیهاست معموری          بسیل اشك باید كند اساس خانهٔ خودرا

سراپا نعمتم باین همه درماندنگی خالد
نمیدانم چەسان آرم بجا شكرانهٔ خودرا

دام بگرفتم بصد جـــان گرد نعلین ترا          هست جانی آن هم از توچون دهم دین ترا
بی توام چندان مطوّل شدشب تـاریك سحر          مختصر خوانم تطاولهای زلفین تـــرا
مـــاه نوبرمهر ثابت عقرب وپروین روان          وەچـــه زیبد هیئتی اشكال بی شین ترا
بر رصد بندان نگر در كشف این تاننگرند          گردروی خـــوی چكان جولان زلفین ترا
نفی جـزء وحصر فردشمس واستلزام او          بس منافی شد دهـــان وزلف وخدیّن ترا
چشم بیمارت دهد درهر اشارت صد شفا          بوعلی مشكل كـــه داند حكمت العین ترا
چـــهرەات زاب دلارایی هـوارا دادەنم          تـــاب رخسارت هویدا كردە قوسین ترا

خالد از ابروی مشكینت اگر گوید سخن

چـــون کشد آخر کمان قاب قوسین ترا

بی روی توام ای مەنو خانه خراب است     زهجر توام صبر بدل نقش بـــر آب است
درخـــواب توان دیدنت وخواب نباید     از بسکـــه مرادیدهٔ اقبال بخواب است
دوشم بنگـــاه تودل از باده غنی بود     خون جگر امشب می وغم جام وشراب است
گـــرباردگردست دهد آن میلعلش     ماراچەغم ازفوت نی و چنگ درباب است

خالد آگر آن عمر گران مایه زکف رفت
افغان چەکنی قاعدهٔ عمر ذهاب است

هرگـــز ترحمّی بمن مبتلات نیست     معلوم شد مراکه توخوف خـدات نیســت
مادر قمار عشق توجان باختیم لیك     باآن دورخ توشاهی وپروای مایت نیست
بـهر بلای جان سخنی جستم ازلبت     خـورسند کن بـــلات هرگز بلات نیست
گفتم مگر حیات بود لعل جانفزاست     گـــفتا کلام بیهده کم گو حیات نیست
گربینم ازوفات ببالین پس از وفـات     مـــقصودم از خدایبغیر از وفایت نیست
خالد زکلکت این غزل دلکشاکه ریخت
جـــز در خور بلاغت پیر هرات نیست

الاای جامهٔ صبر ازغمـت چـــاك     تـــرحّم قـــد دنت للمـــــوت رضاك
تورفتی لشکر جـــانهات درپـی     فیـــا طوبی لروح کـــان یلقـــــــاك
بفرقم پـــــای استغنا نـهادی     بلـــــندم ســـــاختی الله اعـــــلاك
زخـــاك ارلاله سان فردا برآیـم     ترانــــــي هکـــذا حیران سیمـــــاك
بسوگند وعـهــــودت دل نبندم     فـــــان الـــرّب بـــــالاخلاف ربـــاك
بفردوسم مخوان زاهد کـەبی او     لدی اهل الـــنهي مـاطــــــاب طوباك
بمژگان می درد خالد پس از مرگ
تجـــــــاه اللحد حتی نال شواك

بچوگان قضابادا شکسته دست وچوگانم     کەبرهم زد هلال ابروی خورشید تابـانم
مرا سودای چوگان بازی اندر سرکجابودی     اگـــر قلاّب مهرش چنگ واکردی زدامانم
بوجه خون بها برکف گرفته نقد جـــان ودل     بـــامید قبولش از دودیده گوهر افشـانم
غـرامت چون توانم داد زخم ابـــروی اورا     کـه دخل هردو عالم رابموی زان چونستانم





چکد بربرگ نسیرینش دمادم لاله ,زان هردم     چـوغنچه دل پراز خـون همچوگل پاره گریبانم
شفق شد خالد ازخون مشرق پیشانی جـــانان
قیامت خاست , تاکی زندەیی؟ زین نکته حیرانم

چەدولت بود یارب دوش من درخواب میدیدم     کـــەنخل مدّعاراپر برو شاداب میدیدم
سکندر بـهرآب زندگی ظلمت بـریدومـــن     بتاریکی شب ســر چشمهٔ آن آب میدیدم
نگه مل چهره گل خط سنبل وقد سرووشکرلب     مـــژه نشتروش وکاکل چومشك ناب میدیدم
قیامت می نمود از قامت ومیگفت قد قامـــت     بـــروی یارخود حیران شده محراب میدیدم
شب یلدا بــــروی روز رستخیز شد پیدا     دانم یا دو زلفش پر زپیچ و تاب میدیدم
از این تشبیه هـــای نامناسب صـد معاذ الله     کـــه بالله درجهان مانند اونایاب میدیدم
بخاك پاش می غلطیدم وشکرانه می کـردم     تـوگوئی خویش رابر بستر سنجاب میدیدم
زشوق شمع رویش جملة اعضایم برقص آمـــد     زهر مـویش ببند جان دوصد قلاّب میدیدم
ندیدم زان شب فرخنده صبحی پرتو افکن تـــر     اگـرچه کلبه رابی شمع وبی مهتاب میدیدم
تنم یکباره شد چشم از برای دیـــدن رویش     بهر عضوی جمال آن گل سیراب میدیدم



اشارت بر بود خـــالد خواب دوشینم
کەمن بیمارم وگل شکر وعناب میدیدم

مـوسم عید است ومـــانومید از دیدار یـــــار     عـــــالمی درعیش ونوش ماوچشم اشکبار
هرکسی بـــایـار درگشت گلستان است ومن     زاشك ســرخم شد کنار ازداغ هجران لالـەزار
جـــان نثار مقدم جـــانـــان نکرده دم بـــــدم     چیست بـهــره از تفرّجگاه تخت جان[1] نثار
بینواودل پـــراز خـــارو غریب ودرد منـــد     دست بردل ســر بـــزانوچشم درره دل فکار
سینه سوزان دل فروزان کوچه کوچه دربـدر     کس مبادا همـــــــچو من آواره ازیـــارو دیار
بکرەجوئی[2] شد زهر چشم روان از خون دل     عـــاقبت کردم دوا داغ فـــــراق سرچنار[3]
خالد اگرنیستی دیوانهٔ صحرا نورد
توکجا وکابل وغزنین وخـــاك قندهار

چـون کنی ازلعل لب میل شکر ریختن     هر طرف ارزان شود جان بلب آویختن
خنده زنان هــرزمان میںنگری برفلك     عقد ثریّا شود مـــــایل بگسیخـــتن
مەهمەتن روشده چون نگرد بر رخت     نیست وراچـــــارەئی غیر ان بگریختن
از مــژات ای صنم گشته مشبّك تنم     نـــادره پرویز نیست بهر طرب بیختن
دیده مستت فکند شور بـــدور قمر     برسرکویت زبس خـــون جگر ریخـــتن
پاسخ تلخت بلب ده کەچەشیرین بود     لذّت شکر گرفت زهـــــــر زآمیخـــــتن

---

(1)و (2)و (3) ناوی سیٚپردن لەناوچەی سلیٚمانی .

شکوه مکن خالدا ازنرگس فتّان او
عادت مستان بود فتنه برانگیختن

نشتر فولاد یامژگان خون خواراست ایـــــن    نشعه یانگاه چشم بیمارســــــت ایـــن
ژاله بر گل یاخوی خجلت زشرم روی دوست    یاعرق برجبهۀ ستمکار است ایــــن
کلك مـــانی ریخت بربرگ سمن مشك خـــتن    یاخط نوسرزده برروی دلداراست ایـن
شمس خاور برسر سروسهی بگرفته جـــای    یابلا یاخود همین بالاورخسار است این
هست این یاقوت کان یاقوت جـــان بیـــــدلان    آب حیوان یالب لعل شکر بـاراست ایـن
قطره‌ٔآب بقایا رشحهٔ چـــــــــاه ز نــــــخ    سیب بستان ارم یاغبغب یاراسـت ایـن

کیست این کز غمزهٔ جانکاه اودل میرود
خـــــالد دل سوخته یابلبل زاراست این

هـــــردم بگوشم آید از سوز دل صــــدائی    گویاز دردمندان نمانده جــــــائی
برحال خویش گریم از جور زلف شوخی    بینم بدست صیّاد هر مرغ بسته پائی
گلزار حسن جــانان هرگنه خزان نبـیند    آری کــــمی نباشد فردوس رافنائی
بردیده انچـــــــه آید از انتظار رویـــــت    چشم جهان ندیده زینگونه مـاجرائی

خالد زور اشکش دامن پرست دایم
سازد مگر نثارش درپای مه لقائی



مـەولانا خالیـد لـە قەسـیدەکانیدا , پـەیڕەویی لەسـەبکی مـەولانا عەبدورەحمانی جامی دەکات کەنموونەیەکی پوختەی سەبکی خواجە حـافیز نییـە . کـە بەراسـتی سـەبکی ئـەویش نموونەیـەکی ناپوختـەی مـەولانا جامییـە , ئـەو حـەوت خشـتەکییەی مـەولانا جـامی لەگەشـتی حەج , لەستایشی پێغەمبەر(درودی خوای لێبێت)دا هۆنیویەتییـەوە . ئـەویش لەگەشـتی حەجـدا , لەسـەر هـەمان کـێش‌و سـەروا, وەڵامـی داوەتـەوەو لـەو (11)قەسـیدەیەی لێـرەدا بڵاوکراونەتـەوە , چـواریان وەڵامی ئەم قەسیدانەی جامیین :

1–چندز آشوب می فتنه برانگیـختن    مست برون تاختن خون کسان ریختن
2–زهجران برلب آمد جان غمنـــــاك    الا یـــــــالیت شعری ایــــن القاك
3–خیالی بود یارب دوش یادر خواب میدیدم    کـەرویش درنظر برکف شراب ناب میدیدم



4–برکنار دجله دور از یار ومهجور از دیار    دارم ازاشك جگرگون دجـــــله خون درکنار

لەچەند رووەوە , مەولانا خالید دەشوبهێتە مەولانا جامی : یەکـەم توانـایی وبلیمـەتی لـەرادە بـەدەرو یـەکێتی کـات‌و تیژهۆشـی . دووەم جوانی لەشولارو ئاکاری بەرز . سێهەم شێوازی ناسك وشیعری تـەنز ئامێزو بۆ هاتنی خێرا . چوارەم زمانی پاراو وکارایی لە وەڵامدانـەوەو بەگیر هێنانی رەقیبدا . پێنجەم هەردووکیان شێخی گـەورەی زنجیرەی نەقشـبەندی بـوون ولەلایـەن دەسـەڵاتداران وئـەمیران و گـەورەپیاوانی سـەردەمی خۆیانـەوە, رێزیـان لێدەگیرا شەشـەم شارەزایی لـە ئایین و شارەزایی تەواو لەزمان و ئەدەبی عەرەبی وزانستە پەیوەندیدارەکان . حەوتـــەم هـــەردووکیان بەرەچـــەڵەك عـــەرەبن کـــە مـــەولانا جـــامی بەرەچـەڵەکی, خـۆی دەگێڕێتەوەسەر ئیمـام محەمـەد کـوڕی حەسـەنی شـەیبانی ومـەولانا خالیـد خـۆی دەگێڕێتـەوە, سـەر عـەسمانی کـوڕی عـەففان . جگـە لەمانـە , جـامی زیـاتر لـە (80)سـاڵ‌و خالیـد کـەمتر لـە (50)ساڵ تەمەنیان کردووە.

ئەگەر تەمەنی کورتی مەولانا خالید لەگەڵ تەمـەنی درێـژی مـەولانا جـامی وتوانـایی و ناوبانگیـان بـەراورد بکـەین, دەبینـیین کـە مـەولانا خالیـد لـە سـاڵانی کـورتی ژیـانی خۆیـدا , زیـاتر لـە مـەولانا جـامی ناوبانگی دەرکردووە . لە هیندستان‌و ئەفغانستان‌و ئەودیو رووباری ئامون‌و تورکەمەنستان‌و تورکیای عوسمانی وئێران و عیراق‌و سوریاو حیجازو میسردا , ژمارەیەکی زۆر لەزانایان‌و گەورە پیاوان وئەمیران, لەبەرامبـەر مـەولانا خالیـدا, سـەری ویسـتیان دانەوانـدووە, وبـەپێی هەندێ, بەهۆی سوڵتان حسێن میرزا ویەعقوب بەگ , داوەتـی سـوڵتان

محەمەدی فاتیح, یەکێك لە سوڵتانەکانی عوسمانی, بەمەبەستی دیدارو گەشت, بەرەو تورکیای ڕەتکردۆتەوە .

## شاعەبدوڵڵای دەهلەوی ناسراو بە غوڵامعەلی :

یەکێکە لەساداتی گەورە ومەزن و لەساڵی 1158ی کۆچییدا , لە گوندی تبالەی سەربەپەنجاب چاوی بەجیهان هەڵهێناوە , مێژووی لەدایکبوونی, بەپێی حیسابی رستەکان , بەرامبەرە بەرستەی (مظهر جود) دێری خوارەوە لەدایکبوون و تەمەن و کۆچی دوایی شا دەردەخات:

ب(مظهر حود) جاء مدة عیشة (امام) قضی قل, نورالله مضجعة

1158 82

1240

ڕەنگە پێشتریش ئاماژەم بەوەکردبێت کەلەهەندێ ناوچەی ئێران و هیندو ئەفغانستان, بەسەید دەڵێن شا, وەکو: شانیعمەتوڵڵا , شای نەقشبەندو شاقاسمی ئەنوار . شاعەبدوللەتیف باوکی شاعەبدوڵڵا پیاوێکی زاناو داناو عارف و خواپەرست و پێگەیەکی بەرزی هەبوو, لە نێوان گەورەپیاوانی زنجیرەی قادری . ئەویش لەسەر دەستی شا ناسرودینی قادری , مۆڵەتی ئەم تەریقەتەی وەرگرتبوو . شاعەبدوللەتیف سەرقاڵی خواپەرستی و خۆراهێنان و هەوڵدان بوو, گەڵێجار کەبەمەبەستی زیکرو فیکرو بینینی دەستکردەکانی وەستای ڕاستەقینە, ڕووی لەدەشت و بیابان دەکرد , لەگژوگیا خۆراکی خۆی دابین دەکرد . جارێکیان بۆ ماوەی چەندشەو ڕۆژ نەخەوت و تەنیا بڕێکی کەم خۆراك لەشەودا نەبێت , هیچی نەدەخوارد . بۆیە لە پێناوی بەرگریی لە بەرامبەر سەرکەشیی نەفسدا , بۆ ڕۆژوگرتن نییەتی نەدەهێنا , شێخ سەربەتەریقەتی چەشتی و تەریقەتی شەعارییەش بوو .

شا عەبدوڵڵا لە ڕووی لێهاتوویی و بلیمەتییەوە, یەکێك بووە لە کەسایەتییە دانسقەکانی سەردەم, لە بواری مەعقول و مەنقولدا, گەیشتە پلەی زانا بەرزەکانی سەردەمی خۆی . باوکی لە خزمەتی شاناسرەدینی قادریدا بوو, پیاوێکی نارد تا شاعەبدوڵڵای کوڕی, بەمەبەستی وەرگرتنی تەریقەتی قادری, بۆ خزمەتی شاناسردین بهێنێت . بەرێکەوت ئەو شەوەی شا عەبدوڵڵا گەیشتە جێ, شاناسرەدین کۆچی دوایی کرد, باوکی گوتی, مەبەست لە هێنانی تۆ ئەوە بوو, لەسەر دەستی شاناسرەدین بەتەریقەتی قادری شاد ببیت, کەچی خودا لەچارەی نەنوسیبوو, وئێستا لەهەر شوێنێکدا بۆنی ڕۆح بەخشی ئیرشاد بەتۆ دەگات, بڕۆ بەدەمیەوە .

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

شاعەبدوڵلا لەگەڵ کۆمەڵێ لەگەورەپیاوانی زنجیرەی چەشتی، باسوخواسی دەکرد، لەوانە: شێخ زیائوڵلاو شێخ عەبدولعەدل‌و هەردوو کوڕی شێخ ناسر، شێخ محەمەد زوبێرو شێخ میردەرو، مەولانا فەخرەدین‌و شەمسودین حەبیبوڵلا مەزهەری ناسراو بەرۆحی رۆحان کرد، داوای لێکرد کە بچێتە نێو تەریقەتی موجەددییە، میرزای رۆحی رۆحان پێی راگەیاند کە : شوێنێك شایستەی تۆیە کە شەوق‌و زەوقی تێدا بێت، لێرەدا جگە لەلێستنەوەی بەردی بێخوێ، هیچ شتێکی تر لەئارادا نییە .شاعەبدوڵلا بەنیازی تەواوەوە گوتی: ئەوە ئەو پەڕی ئارەزووی منە . میرزا پیرۆزبایی لێکردو لەتەریقەتی موجەددییە وەریگرت .

شاعەبدوڵلای دەهلەوی سەبارەت بەسەرتای ژیانی خۆی دەنووسێت کە: دوای بەدەستهێنانی زانستی حەدیس‌و تەفسیر، لەسەر دەستی شەهید(میرزای رۆحی رۆحان) بەدەستی خۆی تەریقەتی بەرزی قادری پێبەخشیم‌و زیکری تەریقەتی نەقشبەندی فێرکردم‌و نزیکەی(15)ساڵ، لەپاڵ خۆیدا، ئامادەی ئەڵقەکانی زیکر دەبووم، تا ئەوەی مۆڵەتی ئیرشادی گشتی پێبەخشیم، لەسەرەتادا دوودڵ بووم کە ئایا حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە جیهانی مانادا، مۆڵەت و بڕوانامە بەمن دەدات، تا لە تەریقەتی نەقشبەندیدا، دەست بەسەیرو سلوك بکەم یان نا؟ سەرئەنجام ئەو حەزرەتەم لە شوێنێکدا بینی دانیشتبوو وخواجە بەهائودینی شای نەقشبەند لە پاڵیدا بوو، ئەوەی خستە دڵمەوە کە بڕۆم بۆ خزمەتی شای نەقشبەند، دەمو دەس شێخ عەبدولقادری گەیلانی حەزرەتی غەوسی گەورە





فەرمووی: مەبەست هەر ئەوخودایەیە، بڕۆ هیچ دژواری‌و ئاڵۆزییەك لە ئارادانییە.

هەروەها دەڵێت: دابینکردنی بژێوی تەنگی پێهەڵچنیبووم، دەستکورتی‌و هەژاری زۆریان بۆ هێنا بووم، ومنیش ناوی خوام لێهێنابوو،وئەوەم کردبووە دروشمی خۆم، جگە لە حەسیرێك بۆ ڕاخەرو خشتێك لەبری سەرین هیچم نەبوو، گەڵێ جار دەرگای حوجرەکەم لەسەر خۆم دادەخست‌و دەمگوت ئەمە گۆڕی منە . تائەوەی خوداوەندی مەزن دەرووی خێری لێکردمەوەو لە شوێنێکی نەناسراوەوە بەرەکەتی نارد . ماوەی (50) ساڵ لە کونجی قەناعەتدا، ژیانم بەسەر برد. دەڵێن کاتێ دەرگای حوجرەی لەسەر خۆی داخستبوو، پیاوێك هاتۆتە بەردەرگاکەو گوتویەتی، دەرگام لێبکەرەوە کارم بەتۆیە، شێخ دەرگاکەی لێنەکردبۆوەو هەرچەندە داوای کردبوو دەرگاکە بکاتەوە، بێسوود بووە، تا دواتر ئەو پیاوە لە پەنجەرەی حوجرەکەوە، بڕێ روپیەی هیندی فڕێداوەتە نێو حوجرەکەوەو رۆیشتووە .ولەو رۆژەوە ئیتر بژێویی ژیانی بەباشی بەڕێوەچووە .

تا لەئێوارەی شەوی عاشورای 1195ی کۆچییدا، لەئاکامی بریندار کردنی لەلایەن سێ مەغۆلەوە، میرزای رۆحی رۆحان (عاش حمیدا مات شهیدا) شەهید کرا . شاعەبدوڵلای دەهلەوی لە شوێنەکەی ئەودا، دەستی دایە ئیرشادو زیندووکردنەوەی تەریقەتی قادری‌و سوهرەوەردی‌و کیبرەوی‌و چەشتی‌و نەقشبەندی، تائەوەی لە رۆژی دووشەممەی دوانزەی سەفەری ساڵی1240 دا کۆچی دوایی کرد .

شاعەبدوڵڵای دەهلەوی شارەزایی لەزمانو ئەدەبی فارسیو نووسین بە سەبکی نووسینەکانی شێخ ئەحمەد فاروقی سەهرەندی بووە والەخوارەوە چەندین نامەو پەخشانی عیرفانی ئەو زاتە بڵاودەکەینەوە :

ئەم نامەیە وەڵامی مەولانا خالیدی موردیدی خۆیەتی :

مەولەوی خاوەنی پایەی بەرز, سڵاو

بەندە عەبدوڵڵای ناسراو بە غوڵامعەلی سڵاوت ئاراستە دەکات, کەماڵو پوختەی پێشینانت بۆ ئارەزوو دەکەمو ئەو کاریگەرییەی کەگەورە پیاوان بوویانو ئێمەی دەروێش لێی بێبەرین, ولە دەریای پڕی گەورەپیاوان, دڵۆپێك کەوتۆتە کاسەی سواڵی منی پایە نزمەوە . شێوەی بەدەستهێنانی ئەوەیە کە: یەکەم هیممەتو دیققەتکردن, دڵو ئەندامانی تر لە ڕێگەی بزاوتی زیکرەوە دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە, دواتر جێبەجێکردنی (10)ئەرکەکە, نوورو ڕووناکی دەبارێتو مەترسییەکان دەڕەوێنەوە, هەرچەندە زۆر بن, وئاراستەکردن بۆ دەستەبەرکردنی بەرزبوونەوەو بایەخی ئەرکەکان, زیاتر سەرنجت ڕادەکێشن . کەواتە هەردەم مەبەستو هیممەت بەگرتنەبەری ئەرکەکانە, تاوەکو بەیارمەتی حەزرەتی حەق, ڕاکێشان سەر هەڵدەدات و ئەرکەکان ئامادەی ویستی خوداوەندی دەبن . بارو دۆخی ژیان بەبوونی عەدەم پێناسە دەکرێت .

وئەم بزاوتانەی زیکرو کۆمەڵو تێبینیو بەرزبونەوەو ئەرکەکانو بوونی عەدەم, پێشەکین بۆ یاداشتو ئاگاییو ئامادە بوون, وهەر جارێ بوونی عەدەم بەبەردەوامی و بەرودوو گەیاندن دەگات, فەنا دێتە ئاراوە, وئەمەش بێئاگایی و لەخۆدابڕانە, نەك فەرامۆشی کە

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

ئەوە شتێکی ترە . ئەو زاتە دەفەرموێت کە ئەم پێشەکییەی پەیوەندییە لە دەروونی خۆمدا دەبینم, بۆیە سوپاس و ستایشی خودا دەکەم . بەخواستی خودا, لەماوەیەکدا لەگەڵ دەستەی یاراندا, فەنا ڕوودەدات و, ئەگەر لەخەڵوەتێکدا, درێژەت بە زیکرو وەرگرتنی ئاگاییو ئامادەبوون دا, ئەوە هومێدی بەدەستهێنانی مەبەستە, خەڵوەتو گۆشە گیریو پابەند بوون, بەردەوامیی زیکرو وەرگرتنو بەدەستهێنانی پەری ئامادەبوونە لەڕێگای یارانی داخوازییدا . حەزرەتی مەلا سەعدودینی پیری مەلا جامی (ڕەحمەتی خودایان لێبێت) کاری خۆی بەتەنیاییو بەردەوامی زیکرو ئاگایی بەرەو پێشەوە دەبرد, حەزرەتی شای نەقشبەند (ڕەحمەتی خودای لێبێت) بەر لەپلەی کامڵبوونی, مۆڵەتی بە مەلا یەعقوب داوە , خوازیاران لە هاودەمی یەکتردا گەورەترو بەرزتر دەبنو هەر کەمو کورتییەك وەلاوە دەنرێت, بۆیە بە پەیڕەویی لەحەزرەتی خواجە (خودا ڕازداری بکات) مۆڵەتی فێرکردنی تەریقەتمان داوە , وتۆش لە ڕێگەی ڕۆحی پاکی گەورە پیاوانو پشتو پەنای خوداوەندی مەزن بڵاوی بکەیتەوە . کاتەکان بەئەركو کارەکان بەرەچاوکردنی پەیوەندی, بەگەڕانەوە بۆ ڕۆحی شێخە گەورەکان بە پێویست بزانیت, کارکردن بەپێی یاداشتەکان کارێکی گەورەیە, هیوادارین خوداوەندی مەننان بەرەزامەندی خۆی, بە پەیڕەوی خۆشەویستی خۆی (درودی خودای لەسەر بێت) سەرفرازتان بکات, ئامین . لەگەڵ سڵاودا .

نامەیەکی تر

بگات بەدەستی مەولەویی خاوەن پایەی بەرز, خودا بیپارێزێتو خوداوەند بەئارەزووەکانی شادی بکات .

دوای سڵاو پێتان رادەگەیەنم کە: من هەرگیز لە ئێوە دڵزویر نیم, بەخودا هیچ ناخۆشییەك لە ئارادا نییە , بە وتەی کەس لەدڵی خۆتاندا , لەلایەن منەوە رێگە بەهیچ ئەندێشەیەك نەدەن . بەیارمەتیخوداوەندی گەورە بەکاری خوێندنی قورئان و موتاڵای حەدیس و راڤەکردن سەرقاڵ بن , ولە قسەو باس و خۆهەڵقورتاندن پارێز بکەو بایەخ بەفەزڵی خودا بدەو سڵاو چۆنبوون و بێ مەترسی بوون یاخود کەم مەترسی بوون و سەرنج راکێشان لەوماوە کەمەدایە بەم وەهەم و گلەییانەی فەرمووتانە, بەم هەموو نیعمەتانەی حەزرەتی حەق سەرقاڵبن کە ستایشکردنیان ئەرکی سەرشانە . کەواتە هەر کارێ بەپێچەوانەی بڕواوە بێت, لە ئێوەدا چاوەڕوانی ناکەین, ئێستا گەڵێ گەرمەو گەشت کردن مەحاڵە, بەپابەند بوون بەبەردەوامی سوپاسگوزاری و چاکسازیی دەروون و پاکژکردنەوە سەرقاڵ بن, هەرکاتێ مامەڵەی تایبەت بەدەروون خۆبەخۆ گەشە بکات, بایەخ بەدیداری سەروتر دەدرێت, لەوە دڵنیابن لەگەڵ درووددا .

وێنەی مۆڵەت نامەکەی کە بۆ مەولاناخالیدی داڕشتووە:

بەناوی خوداوەندی بەخشندەو میهرەبان, دوای ستایش و درووود, بەندە عەبدوڵڵا موجەددی نەقشبەندی (خودا لەگوناهی خۆش بێت) رادەگەیەنێت کە: مەولانا خالید (خودا بیپارێزێت) سەرکاروانی زانایانی ئایین و گوڵبژێری داخوازیکەرانی رێگەی حەق, بۆ وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی لەدەڤەری کوردستانەوە هاتوونەتە لای بەندە, تاوەکو (10)مانگ لەخەڵوەتدا, بەزیکرو کارو بەوپەڕی تواناوە سەرقاڵ بێت . سوپاس بۆ خوداو بەهیمەتی پیاوچاکانی مەزن (رەحمەتی خودایان لێبێت) کە پلەو پایەی تەریقەتیان بەرز

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

کردۆتەوەو بەئامادەبوون ویاداشت و پاکژکردنی جیهانی فرمان و فەناو مانەوە چەکدار بوون. حاڵەتێك کەبەسەر شێوازی ویژدانی پەیڕەوی تەریقەتی حەزرەتی موجەددی (رەحمەتی خودای لێبێت)دا دێت, دەروونیان رووناك دەکاتەوەو لەکەماڵی تەریقەتەوە بەکامڵکردنی گەیشتن . بۆیە مۆڵەتی جێنشینی و پەروەردەکردنی تەلەبە سەرکەوتووەکانمان بەو بەخشی و لەتەریقەتی قادری و چەشتی و سوهرەوەردی و کوبرەوی (رەحمەتی خودایان لێبێت)دا, مۆڵەتمان پێدا, هەروەکو لەم تەریقەتەدا باوە, دەستی ئەو دەستی منەو ئەو جێگرو جێنشینی راستەقینەی پیرانی منن, رەزامەندیی ئەو رەزامەندیی منەو, نارەزامەندی ئەو نارەزامەندی منەو, هەردەم سەرقاڵی زیکرو ئاراستەکراوەکان و چاودێرییەکان و پەیڕەوییکردنی سوننەت و پارێزکردن لە داهێنانی ئایینی و سەرقاڵی کاری زانستەکانی راڤەکردن و حەدیس و سۆفیگەریی و رێنموونی تەلەبەکان بن .

اللهم اجعله للمتقين اماما وصلیالله على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين .

نامەیەکی تر:

بۆ بەڕێز خاوەن فەزڵ و مەعریفە, حەزرەتی مەولانا خالید(خوداوەند بۆ سوودی موسڵمانان بیپارێزێت), دوای سڵاو پێتان رادەگەیەنم کە سوپاس بۆ خودا کە تاهەژدەیەمی مانگی زیقەعدە ساغو سەلامەتیت بۆ گەڕایەوە, ودوعای خێرتان بۆ دەکەم و دوعای خێریش بۆ بەندە بکەن, برەو پەیداکردنی تەریقەت بەهەوڵی ئێوە لەو دەڤەرەداو بەدڵسۆزیی, پێمان دەگات(الحمدلله اللهم زد فزد),

لەتەریقەتی قادریو چەشتی زیکری ئاشکرا برەوی هەیە, مۆڵەتی فێرکردنی ئەو دوو تەریقەتەشمان داوە کە هەوڵی فێرکردنو بڵاوکردنەوەی زیکری ئاشکرا و نهێنیو رووکردن لە یەزدانو لە دڵ ببێتە هۆی خۆشەویستیو مەعریفە . خوای گەورە پیرۆزی بکات و هەروەها لە تەریقەتی کوبرەویو سوهرەوەردیشدا, لەگەڵ رێزمدا [1].

شێوازی نووسینی سادەو رەوانی پەخشانی فارسی لەسەدەی (11)ی کۆچیدا, لەنێوان شێخەکانی سۆفیگەریی هیند, بەئەو پەڕی گەشەسەندن و پەرەپێدانی خۆی گەیشت, لەکاتیکدا لەهەمان سەدە لەئێراندا کەلانەی زمانی فارسییە, پەخشانی فارسی تێدا رووەو کزبوون دەچوو, گەورەترین نووسەرانی سۆفیگەریی هیند کەبەرهەمی فراوانی بەزمانی فارسی لەدوا بەجێماوە, شێخ عەبدولحەقی دەهلەوییە لەگەورەپیاوانی قادری, یەکێك لەبەرهەمەکانی, راڤەکردنێکە بەزمانی فارسی, لەژێر ناوی (اشعة اللمعات) کە خوێندنەوەی کتێبی (مشكاة المصابيح)ی شێخ وەلیودینی ئەبوعەبدوڵلا موحەمەد کوڕی عەبدوڵلای خەتیبی عومەری تەبرێزی لە رەمەزانی ساڵی 737دا لەنووسینی کتێبەکەی بووەوە, لەساڵی 738دا کۆچی دوایی کرد . ئیبن خەتیبی تەبرێزی کە جگە لەکتێبەکەی خۆی کتێبی (مصابيح السنه بغوی)یشی تەواو کردو ئەم کتێبە لە ساڵی 1809زایینییدا,وەرگێررایە سەر زمانی ئینگلیزی .

کتێبی (اشعه اللمعات)لە چاپخانەی تیج کۆماری شاری (لەکهنو) لەهیندستان, لە چوار بەرگدا ولە 1532 لاپەڕەی 27 دێرییدا بەخەتی فارسی(نەستەعلیق)چاپکراوە . شێخ عەبدولحەقی دەهلەوی کتێبێکی تریشی بەناوی (اخبار الاخيار) سەبارەت بە مێژووی شێخە





سۆفییەکانی هیندستان بڵاوکردەوە, وەکو شەرحێك بۆ نووسینی حەزرەتی شێخ عەبدوالقادر گەیلانی کە لە پەراوێزی ئەم کتێبەدا, نووسینەکانی شێخ عەبدولحەق بەخەتێکی ورد نووسراوە . شێخ عەبدولحەق لە پێشەکی کتێبی(اشعةاللمعات)دا, چوار خەلیفەکەی سوننیەکانو کۆمەڵێکی تر لە پیاوانی حەدیسی هێناوەتەوە کەلەو نێوانەدا, بەمەبەستی خستنە رووی پەخشانی فارسی ئەو, لە وەرگێڕانەکەی (دار قطنی) هەڵدەبژێرین:

دار قوتنی: ئەبولحەسەن عەلی کوڕی عومەری دار قوتنی, حافیزی حەدیس و زانای بەناوبانگو وتاربێژی کاملو هزرمەندو کارگێری بێهاوتای چەرخی خۆیەتی, لەزانستی حەدیسو زانینی هۆکارەکانیو ناوی گەورەپیاوانی حەدیسدا بێهاوتا بوو. بەراستگۆییو ئایینداریو موتمانەو عەدالەتو بڕوای راستەوە, ودەڵێن کەدوای ئەو, لەو بوارەدا کەسێك نەهاتووە و ئەم هونەرە لەودا کۆتایی هات, ولەراڤە کردنو فیقه و ئەدەبو شیعردا, کامڵ بوو. فیقه و روایەتو حەدیسی لە ئەبو سەعید ئیستەخرییەوە وەرگرتووەو, حافیز ئەبو زەعیم و ئەبو بەکری بەرقانی و جەوهەری وقازی ئەبو تەییبی تەبەریو حاکم ئەبو عەبدوڵلا نەیشاپوری لەبارەیەوە دەگێڕنەوە, ولەویان پرسی کەکەست بینیوە وەکو دار قوتنی بێت, گوتی, ئەو خۆی لە وێنەی خۆی نەدیوە, ئیتر من چۆن ببینم . لە ساڵی 305 یان 306 لە بەغدا لەدایك بووەو رۆژی چوارشەممەی (22)ی زیقەعدەی ساڵی 385 لەهەمان شوێندا, کۆچی دوایی کردوە.

یەکێکی تر لە فارسی نووسەکانی سۆفیگەریی هیند لەسەدەی یانزەی کۆچی, شێخ ئەحمەدی فاروقی سەهرەندییە, ناسراوە بە ئیمامی رەببانی(موجەدیدی ئەلیفی دووەم). هەروەها چەند بەرهەمێکی پڕ بایەخی بەزمانی فارسی دوای خۆی بەجێهێشتووە کە بە پێزتریان کتێبی (مکتوبات)ە . شێخ لەو کتێبەدا, وردەکاری پەیڤو عیرفان و شوێنی هەوادارانی تەریقەتو مەقاماتو پلەو پایەیان بەزمانێکی سادەو شیرین خستۆتە ڕوو .

چەند دێڕێك لە یەکێك لە نووسراوەکانی بڵاو دەکەینەوە :

بزانە کەمانای(تخلقوا باخلاق الله) کە لەویلایەتدا وەرگیراوە ئەوەیە کە بۆ وەلییەکانی خودا رووبدات, هەر وەلییەکی خودا خاوەنی ئاکاری گونجاو بێت , هەر کارێك کە خوداوەند بەئەرکی دانابێت . بەڵام ئەم بۆنەیە لە ناودایە و بەشداریی لە گشت ئاکارەکان لە مانا تایبەتەکاندا کە خوداوەند بەئەرکی دانابێت, کە مەحاڵن و پێویستییان بەهەڵگەڕانەوەی راستییەکانە کە لەتوێژینەوەکانی خواجە محەمەدی پارسا (خودا رازداری بکات)دەفەرموێت لەبواری روونکردنەوەی مانای (تخلقوا باخلاق الله) ئاکارێکی تری خودایەو مانای مەلیك بۆ هەموانە, هەر کەهەوادار زاڵ بێت بەسەر رێگەی نەفسی خۆیدا و بتوانێت کۆنترۆڵی بکات, ئەوا دڵەکان یەخسیر دەکات, بەو ئاکارە وەسف کرابێت . ئاکارێکی تر گوێڕایەڵ بێت, کەپەیڕەوی رێگە , وتەی حەق لەهەر کەسێکەوە بێت پەسەندی دەکاتو رازەکانی سروش وراستییەکان بەگوێی رۆح دەشنەفێت و ئەو ئاکارەی تێدا بێت . ئاکارێکی تر ئەوەیە بینا بێت, هەرکە کەسی پابەند بەدیدەی بینایی بینا بێت و بەنوری ئاگایی هەموو کەمو



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

کوڕییەکانی خۆی وبارو دۆخی ئەوانی تر ببینێت . واتە هەموو کەسێك باشتر لەخۆی ببینێت وهەروەها بینینی حەق رەچاو بکات, وئەم کارەی تێدا بێت, ئاکارێکی تر زیندوو کەرەوە بێت, وهەر پابەندێك رێگەی زیندووکردنەوەی سوننەت بکات بە پیشەی خۆی و ئەم ئاکارەی تێدا بێت . ئاکارێکی تر ئەوەیە بتوانێت بمرێنێت و هەرکەکەسی پابەند رێگە بەخەڵك نەدات لەجێگەی سوننەت کاری (بدعە)ئەنجام بدەن, ئەوا ئەم ئاکارەی تێدایە .

## شێخ سیراجودین عوسمانی نەقشبەندی موجەدیدی خالیدی

بەرلەوەی باسی ژیانی عارفو شاعیری لاو حاجی شێخ عەبدورەحمانی‌نەقشبەندی (وەفا) بکەین لەسەر زاری باوکی رێزداریەوە, شێخ سراجودین عوسمانی نەقشبەندی , ولەبەر ئەوەی تەریقەتەکەی نەقشبەندیی موجەدیدییە, بۆیە بەباشم زانی کەسەرتا ,

موجەدید واتە شێخ ئەحمەدی فاروقی سەهرەندی (سەرهەند) بەخوێنەران بناسێنم ودواتر بچمە ناو کرۆکی باسەکەوە :

شێخ ئەحمەد فاروقی سەهرەندی, ناسراو بەرەببانیو موجەدیدی ئەلفی سانی, بە(28)پشت دەچێتەوە سەر حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب (خودا لێی رازی بێت), لەساڵی 971ی کۆچییدا لەدایك بووە, وبەهۆی تیژ هۆشی و بلیمەتییەوە, لەماوەیەکی کەمدا, توانی خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان تەواو بکات, ولە سەردەستی باوکی خۆی شێخ عەبدولئەحەد مۆڵتی تەریقەتی چەشتی وقادری و سوهرەوەردی و کوبرەوی وەرگرت, باروبنەی بەمەبەستی گەشت بۆ حەج پێچایەوە, کەگەیشتە شاری دەلهی , بەهاوڕێیەتی خواجە محەمەد باقی بیللا مەرزوق و لەسەردەستی ئەو تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت , لەماوەی دوومانگ و چەند رۆژێکدا , نازناوی نەقشبەندی بەدەستهێنا, بەوەی هەر لەو رۆژانەدا, خواجە محەمەد باقی بیللا, دەربارەی ئەو بۆ یەکێك لە دڵسۆزانی خۆی دەنووسێت :

(( ئەحمەد ناوی پیاوێکە خەڵکی سەرهەند , زانایەو کردە, ماوەیەك لەگەڵ هەژاراندا ژیاوەو گەلێ کاری سەرسووڕهێنەر لەودا بینراوە, وادەردەکەوێت کە ببێتە خۆرێك و جیهان لەسایەیدا رووناك بێتەوە))

هەروەها دەڵێت: (( شێخ ئەحمەد خۆرێکە کە هەزارانی وەك ئێمە لە سایەیدا ونن )) .

شتی زۆری وەك ئەو ستایشانەی خواجە دەگێڕنەوە , کەلەم دەرفەتە کورتەدا بواری گێڕانەوەیان نارەخسێت, هێندەی نەبرد کە ناوبانگی کەماڵی رواڵەت و دەروونی شێخ ئەحمەد , دەوروبەری



گرتەوەو تاقمێك لە توێژی جۆراو جۆری رووبان لێی کردو خۆیان بەوەوە بەستەوە , ئەو لە زانستەکانو پایەی عیرفانو ئۆقرە گرتنو رەزامەندی و تەسلیم بوونو رێزناندا و بەشێوەیەکی رێژەیی و بەپێی حاڵەتی بەرامبەرەکەی, و بەزەیی بەخەڵك و پەیوەندیی خزمایەتیو رەچاوکردنی چەمکەکانی مافو دەستپێشخەری لە سڵاوکردنو نەرمونیانی لە قسەکردندا, تاکانەی چەرخی خۆی بوو .

شێخ ئەحمەد لەدوارۆژانی ژیانییدا, ئەرکی وانە وتنەوەی بەکوڕەکانی سپاردو خۆشی گۆشە نشینی هەڵبژارد , تا ئەوەی لەسەرەتای مانگی رەبیعولئەوەڵی ساڵی 1034ی کۆچیدا, کۆچی دوایی کردو گیانی پاکی سپارد بەخوداو بەرەو بەهەشت چوو(رەحمەتی خودای لێبێت) .

شێخ ئەحمەد چەندین نووسراوی هەیە بەزمانی فارسی کەبە پەخشانی گەلێ پاراوی ئەو سەردەمە لەقەڵەم دەدەرێن, ئەگەرچی لەو سەردەمەدا, پەخشانی فارسی لە ئێراندا بەرەو کزی دەرۆیشت, بەڵام لەهیندستاندا گەشەی باشی کردبوو . ئەم راستییە لەرێگەی نووسراوەکانی شێخ ئەحمەدی فاروقی کەچەند پەرەگرافێکی لێ بڵاودەکەینەوە, بەباشی دەردەکەوێت :

بۆ شێخ بەدیعودین: ((ئەو نامە پیرۆزەی بەشێخ فەتحوڵڵادا ناردبووت گەیشت, سەبارەت مەینەت و گلەیی و سەرزەنشتی خەڵکی نووسیبوویان, ئەوە پەناگای زێبای ئەم خەڵکە و پاکژکردنەوەی ژەنگو تەڵخی ئەوانە . بۆچی ببنە مایەی دڵتەنگی, سەرەتا کە بەندە گەیشتمە ئەم قەڵایە, واهەست دەکرا کەرووناکی گلەیی خەڵك لەشارو گوندەکان, وەکو رەنگی هەوری نورانی, بەلێشاو

دادەباری‌و, کاری بزواندن‌و راپەڕین دەگەیەننە ئەو پەڕی, سالأنێك بەپـــەروەردەكردنی جـــوانی قۆناغگـــەلێكی بڕیـــوەو ئێســـتاش بەپەروەردەكردنی گەورەیی هەنگاو دەنێت, ولەپێگەی ئۆقرە گرتن‌و لەپێگـــەی رەزامەندیـــداین‌و جـــوانی‌و گـــەورەیی یەكســـان ببیـــنن . نووسیویانە كە لەو كاتەوە ئاشوب سەریهەڵداوە, شادی نەماوەو نەك هەر دەبوا زەوق‌و شادی دووبەرامبەر بوایە, ئەوەتا دڵتەنگی‌و رەنجی خۆشەویســت زیــاتر لەوەفاكــەی چــێژداره . چ بەلأیەكــە ســەبارەت بەرەنگی خەڵكی رەشۆك قسەوباس بكرێت, گەڵ لەخۆشەویستی خود دووركەوتوونەتەوەو, بەپێچەوانەی جارانەوە, گەورەیی دەدەن بەسەر جوانیـــدا, وزیـــاتر لـــەوەی بایـــەخ بەنیعمەتـــەكان بـــدەن, بایـــەخ بەپەخشكردنی دەدەن, چونكە لەجوانی‌و نیعمەتەكاندا, موراد‌و نیازی خۆشەویســت گوزارشــت لــە مــرازی خــود دەكــات‌و, لەگــەورەیی‌و پەخشكردندا خۆشەویست تەنیا مرازو مورادەو بەپێچەوانەی مرازی خودەوەیـــە, مـــورادو مـــراز لێـــرەدا, كـــاتی رابـــردووە( شـــتّان مابینهمـا)چـەندە لەیـەكترەوە دوورن ! باسـی زیـارەتی مـاڵی خـوداو پێغەمبەریان كردبوو, كارێكی پەسەندە (حسبنا الله ونعم الوكیل) )).

**بـــۆ مـــیر موحیبـــوڵڵا**: دوای ســـتایش‌و دروودو نـــاردنی ســـلأو, پێتانڕادەگەیـەنم, نامـەی پـیرۆزی بـرای گـەورەم مـیر سـەید حـەبیبوڵلأ گەیشت .شادی لەگەڵ خۆیدا هێنا . چارەنییە دەبێ خەڵكی بەرگەی ئـەو ئازارانـە بگـرن و خزمـان لەسـەر ئـۆقرە گـرتن لەبەرامبـەر ئـەو دڵتەنگییانە رابهێنە. قال الله تعالى آمرا لحبیبه علیه الصلواة والسلام : فاصبر كما صبر اولو العزم من الرسل ولا تستعجل لهم . خوداوەندی گەورە بە خۆشەویستەكەی (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی:





ئۆقرە بگرە هەر وەكو چۆن پێغەمبەرانی ئولولعەزم ئۆقرەیان گرت‌و پەلە مەكە .

نمەك لە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەو پلەوپایەیەدا, هەمان رەنج‌و ئازارە, وئێوە لە ئاستی هەڵهاتن لەو نمەكەدان .

بەڵێ سوپاسگوزار لەنمەك ناترسێت, دەسەلأت چییە:

هرکە عاشق شد اگرچە نازنین عالم است نازکی کی راست آید بارمی باید کشید

وابڕیـاربوو ئەگـەر مۆڵـەتم بـدەن لـە ئاڵـەئاباد نیشـتەجێ بـبم, خانوویەك دەستنیشان بكەن, تاوەكو لە دەست رەنج پەنای پێ ببەن‌و هەندێ پشوو بدەن (هذا هو طریق الرخصة وطریق العزیمة و الصبر والتحمل علی الایذاء: ئەمەیە رێگەی مۆڵەت‌و رێگەی ورە ئۆقرەگرتن‌و بەرگەگرتنی ئازار. لەم ساتەدا, ناتوانایی زاڵ بوو بەسەرمدا, هەروەكو بەلاتانەوە, ئاشكرایە . بۆیە بەچەند وشە كۆتاییم بە قسەكانم هێنا).

هـەروەكو لـەناوەرۆكی كتێبی (خزینة الاصفیاد)دا دەردەكـەوێت : نـورەدین جیهـانگیر شـای پاشـای هینـد بەهـەوڵی هاوسـەرەكەی نـور جیهانی بیگەم, میانەی لەگەڵ شێخ ئەحمەد فاروقی سەهرەندیدا باش نەبووە .

جارێكیـان لای شـا, شـێخ تاوانبـار دەكـەن كـە: پلـەو پایـەی خـۆی لەپلـەی ئـەبو بـەكری سـدیق بـەرزتر دەزانێـت, شـا لـەرووی گلـەیی كردنـەوە, داوای روونكردنـەوەی لێكـرد . ئـەویش بەبەڵگـەی هـزری و روایەت‌و عرفانی, قەناعەتی بە شا كرد كە: ئەوە تومەتێكی دوور لە راستییەو دەستكردی بیری دوژمنانە .

جارێکی تریش دوژمنان لە ڕێگەی نور جیهان بیگەم، ئاگری ئاشوبیان لای جهانگیرشا بەرپاکرد کە گوایە شێخ ئەحمەد تاقمێکی زۆری لە موریدەکانی خۆی گلێر کردۆتەوەو بەتەمایە شۆڕش بکەن و لە شا یاخی بن . پاشا داوای لێکرد کرنووشی شایانەی بۆ ببات، شێخ ئەم کارەی بەپێچەوانەی شەرع زانی و ئەنجامی نەدا . جهانگیر بەو کارە قارس بوو، ئەوەی کردە بیانوویەك و لە بەندیخانەی دانا ، شێخ ئەحمەد دووساڵ لە بەندیخانەدا مایەوە، دوای ئەوەی پاشا ئازادی کرد . خودی شێخ دەڵێت کە: ئەو بەند کردن و سووکایەتی پێکردنە، بووە هۆی گەشەی مەعنەوی زیاتر بۆی . مەخابن خەڵکی رەشۆك، تاوانی ئەم رووداوەیان لە ئەستۆی شێخ عەبدولحەقی دەهلەوی گەورە زانای دین و ناوداری ناو شێخانی زنجیرەی قادری ناو، وەها گەورە پیاوێکیان بەم تاوانە تاوانبار کرد، بەجۆرێ کە داستانی ئەم کردە دروستکراوە، بەسەر لاپەڕەکانی مێژووەوە بمێنێتەوە (ولیس هذا اول قارورة کسرت في الاسلام).

شێخ عەبدولحەقی دەهلەوی ماوەی 94 ساڵ تەمەنی کرد، زیاتر لە (12)ساڵ لە شێخ ئەحمەدی سەهرەندی گەورەتربوو ونزیکەی (18)ساڵ دوای ئەو کۆچی دوای کرد . شێخ عەبدولحەقی دەهلەوی، شەرحێکی بەچێژی بەزمانی فارسی لەسەر (مشكاه المصابيح)ی شێخ وەلیودین ئەبو عەبدوڵلای خەتیبی عومەری تەبریزی(کەلەساڵی 738ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە) نووسیووە . وناوی ناوە (اشعة اللمعات)و جوانترین کتێبی بواری پەیڤە . چەند کتێبێکی تری وەکو (اخبار الاخبار)سەبارەت بە زیکری شێخە سۆفیگەرەکان، وەرگێڕانی (فتوح الغیب)ی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و چەندین نووسراوی





بەزمانی فارسی هەیە. لە 958دا لە دایك بووەو لە 1053ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردووە . نزیکەی (100)کتێبی هەیە .

لێرەدا بۆ شارەزابوون لە شێوازی داڕشتنی پەخشانی فارسی، لە لایەن شێخ عەبدولحەقی دەهلەوی، دواوتەی لە کتێبی (اشعة اللمعات)دا بڵاو دەکەینەوە :

(( عن بهز بن حكيم عن ابيه عن جده انه سمع رسول الله صلى الله عليه واله وسلم ، يقول في قوله تعالى: كنتم خير امة اخرجت للناس . قال انتم تتمّون سبعين امة انتم خيرها واكرمها على الله: گوتی ئێوە حەفتا ئومەتەکە تەواو دەکەن و ئێوە باشترین و گەورەترینیانن و، مەبەست لە حەفتا فراوانییە نەك سنووردار کردن و ئەم ژمارەیە بۆ زۆر شتی تریش بەکار دەبرێت و مانای فراوانی هەیە .

وەرەنگە زۆربەی ئۆمەتەکانی پێشوو وجەماوەرو بەناوبانگەکانیان، هەر بەو ژمارەیە لێکبدەنەوە، موڕادو مەبەست دواییینیانە، هەروەکو پێغەمبەر کەدوا پێغەمبەرە، ئێوە دوا ئۆمەت و باشترینیانن، کۆتایی کتێبیش بەم وتەیە کە گوزارشت لە کۆتایی و تەواوکردن و کامڵکردن دەکات، باشترین کۆتاییە)) .

## (وەفا) و لە دایکبوون و شوێنی نیشتەجێبوون و بنەماڵەو باوك

وەفا لە شارۆچکەی تیوڵە یان تیوڵێ لەدایك بووە, سەربەناوچەی هەورامانی لهۆنە, دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دەشتی شارەزوور, کە ئێستا لەخاکی عێراقدایە, وبەهەڵە بەتەوێڵە یان تەوێڵی ناودەبرێت . تیوڵە نزیکە(1000)ماڵە, بەزمانی کوردی گۆرانی, واتە زاراوەی خەڵکی هەورامان, دەدوێنو هەموویان سوونئین لەسەر ئاییئزای ئیمامی شافیعین (ڕەزای خوای لەسەر بێت) . تیوڵە ناوچەیەکی کوێستانەو باخو باخاتی چڕەو ئاووهەوای سازگارەو دیمەنی دڵڕفێنی تێدایەو لە چیاکانیدا کەڵەکێویو ئاسكو بزنە کێوی فراوانە, بەڵام دیمەنی شارۆچکەکە, لەبەر ئەوەی دەکەوێتە نێو دۆڵێکەوە, هێندە دڵفڕێن نییە . ڕەنگە ناوی تویڵە ئەوە بێت کەلەلایەن یەکێك لە پاشاکانی ئێرانەوە لەو دەوروبەرەدا, بەناونیشانی تیوڵ بەکەسێك بەخشرابێت, وئەوەش دواتر بووبێت بەناوی ئەو شوێنە . تیوڵ وشەیەکی تورکییە بەمانای کۆمەكو مووچەو موڵكو بەکرێدانی خانووبەرەو زەوییە, یاخود سەرپەرشتی کۆکردنەوەی باجی گوندێك لەلایەن دەوڵەتەوە, بەیەکێك لە خزمەتگوزارانی خۆی دەسپێردرێ, لەبری مووچەیەکی دیاریکراودا . شایانی وتنە, بەر لە دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر ئەو ناوچەیەدا, ئەو شارۆچکەیە هەر ناوی تیوڵە بووە.

لەم شارۆچکەیەدا, مەزاری یەکێك لەعارفانی بەناوبانگی کوردی تێدایە, کە لەزۆربەی شوێنە موسڵمان نیشینەکاندا, ناوی دەبەن . لەم شارۆچکەیەدا, شێخ سراجودین عوسمانینەقشبەندی لەدایك بووە کە ناوبانگو کەماڵو عرفانی, زۆربەی ناوچەکانی ئاسیای گرتۆتەوە . شێخ سراجودین کوڕی خالید ئاغایە, باوكو باپیری لە نەجیبزادەو







گەورەپیاوانو دەسەڵاتدارانی ئەو شارۆچکەیە بوونو لەتەواوی ناوچەی هەوراماندا, ڕاوێژکاری خەڵکی بوونە, ولەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو شارۆچکەیە بوونەو لەتەواوی ناوچەی هەوراماندا, ڕاوێژکاری خەڵکی بوونە, ولەلایەن دەسەڵاتدارانو فەرمانڕەوایانو والیانی سەردەمی خۆیاندا, کاروباری سەرپەرشتی کردنی ئەو شارۆچکەیان پێ سپێردراوە, بەتایبەتی خالید ئاغا لەلایەن میرانی بابانەوە, ڕێزی تایبەتی لێگیراوە .

حاجی شێخ عەبدوررەحمان(وەفا)و براگەورەکەی شێخ بەهائودین محەمەد ئەبولبەها , هەردووکیان لە ڕووی ڕاستگۆییو ویستو دڵسۆزییەوە, بەچەند شیعری پاراو, ستایشی باوکی خۆیانیان کردووە, کە ئاماژە کردن بەهەندێکیان بێسوود نییە:

## ستایشی وەفا :

بازم ازنوای حریفان شور دیگر درسراست  سینەام گـوئی زسوز آتش دل مجهراست
ازخیال ابروی همچون هـلال مهوشم  دامنو حبیبم زاشك دیدگان پـرازاخترست اینکه
بریای خیـال یـار بـارم روزو شب  اشك پندارند مردم لیك لعل وگـوهراست
برگلستـان صفا بادصبا چون بگذرد  از قدومش کوهو صحرا پـراز مشك اذفر است
نخل امید وفـای دوست درباغ امل  گرچه خوش قامت بود امّا نهال بی براست

## ستایشی شێخ محەمەد بەهائودین ئەبولبەها :





از صفاو بهجت دوران کسی دل شیاد نیست     غیر آنکه رسته ازخوددر جهان آزاد نیست
درنخستین گام ترك کرد ازآنکه     صیدرا آزادگی ازدام آن صیاد نیست جلوه
بنمای ای سرخیل خوبان تاشود     تازه آن عهدی که عهد لیلیش دریاد نیست
روی زیبا قدر رعنا چشم شهلای توبس     حاجت گل یاسمین یانرگس وشمشاد نیست
ای دل ازمن این نصیحت گوش کن گرصادقی     شیوهٔ عشاق کویش شکوه از بیداد نیست
بولبها گرزانکه خواهی کشف راز عشق را     ازسراج الدین طلب چون وی کسی استاد نیست

کوه حلم وبحر عرفان شیخ عثمان آنکه شد
عرش رحمانی دلش, زین خوبتر بنیاد نیست

تەنیا کوڕەکانی خودی شێخ سراجودین ئەویان ستایشی نەکردووە, بەڵکو بیری وێنایی مەعنەوی و پایەی بەرزی و عیرفانی لە ئاستێکدا بوو کە زانایانی پایە بەرزی سەردەم, لە نووسینە بەهادارەکانی خۆیاندا, ستایشیان کردووەو باسیان لەتایبەتمەندییە باشەکانی کردووەو بەنەمریان لەقەڵەم داون . بۆ نموونە مەولەوی سەید عەبدوررەحیم (مەعدوم) لە خێڵی تاوگۆزی, کە یەکێکە لە بەشەکانی هۆزی باباجانی (باوەجانی)ی جافی جوانرۆ, لەعەقیدەی مەرزییەدا, بەزمانی کوردی, بەم جۆرە ستایشی شێخی کردووە :

شوڵەی ئەو نیسبەتی موجەددییە     لمطلعها الفتحیة
بۆ دفعی زوڵمەت لە نزیكو دوور     سەرەیانی کرد بلوور ئەو بلوور
تادای لەبلووردانی شنەفتە     شارەزای سارای ئەتواری هەفتە
واسیتەی ڕێگەی بەینی عیلمو عەین     واریثی حائیز حەیای زینورەین
سیراجی وەهاجی شەرع وتەریقەت     سەرمایەی رواجی کاڵای حەقیقەت
حورمەتی نەهێشت گوستاخی کردن     نام نامی ئەو بەسەریح بردن
لەودڵی ناجنس رنگی ترئاوەرد     زیندەی ئەبەد بوو تێدا زیاد کرد

(لەو دڵی ناجنس)ی دوا دێڕدا, بەپێی بنەمای هێما, (شێخ عوسمان)دەگەیەنێت, دڵی ناجنس کە هەڵگەڕاوەیەتی و دەکاتە (سنجان) وهەر جارێ سنجان ڕەنگێکی تری بەخۆوە گرت, واتە ببێت بە موسەححەف, ئەوا بەشێخان دەبێت, ومەبەست لە (زندەی ئەبەد), لابردنی پیتی (ه) لەکۆتاییدا کە (زند) دەمێنێتەوە وهەرکە پیتەکانی (ز ن د) لەدەرووندا لەرادەبەدەر پێشبخرێت,

(ع س م) بەدەست دێت, واتە زندەی ئەبەد, واتە بێ پیتی کۆتایی کە پیتی (ه)یەو پێشخستنی (ز ن د), بەپێی حسابی رستەکان لەخانەی یەکان بۆ دەیانە و لەدەیانەوە بۆ سەدانە, بەم پێیە,

(ز) کەحەوتە, حەفتا (ع) و (ن) کەپەنجایە, پێنجسەد (ث)و (د) چوارە دەبێت بە چل (م) .

مەولەوی سەید عەبدوررەحیم/ مەعدوم لە هۆنراوەی فەزیلەتدا, بەعەرەبیش ستایشی شێخ سراجودین عوسمانی کردووە, هەروەها مەلا حامیدی کاتبیش, لەدووبەرامبەر کردنەکانی کتێبی (ریاض المشتاقین)دا, شێخی بەشێوەیەکی جوان ستایشی کردووە . دوای ئەم پێشەکییە, ئیتر نۆرەی ئەوەیە بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان :

شێخ سراجودین لە ساڵی 1195 کۆچی, لەشارۆچکەی تیوڵە لەدایك بووە, هەر لەوێدا پەروەردە بووەو لەژێر چاودێریی پەروەردەکردنی باوکی ڕێزدارو خواناسدا . خالید ئاغای باوکی لەو دەڤەرەدا, دەسەڵاتی هەبووە .

خاوەنی دەسەڵاتو نۆرێنو پیاوێکی ناودار بووە, خەڵکی ئەو ناوچەیە گوێرایەڵی فرمانەکانی بوون, جگە لەشێخ سراجودین عوسمان, کوڕی تری هەبوو, لەوانە عەبدول ئاغاکە هەریەکەیان,







بەپێی توانای خۆیان لە سنووری پێگەی‌و دەسەڵاتی باوکیاندا, سەرقاڵی کەسابەتو دابین کردنی بژێویی خۆیان بوون .

شێخ عوسمان هەر لەسەرتای دەورانی منداڵییەوە, لە خزمەتی زانایانی تیوڵەدا, سەرقاڵی فێربونی قورئانو پێشەکییەکانی زمانی فارسی‌و عەرەبی بوو. دڵی بۆ شتێکی تر, جگە لە چەمکەکانی ئایین‌و فێربوونی زانستەکانی شەرع‌و یادکردنی خوای گەورە, لێینەدەدا . چوونەوەی بۆ سەر باوکی کتومت وەکو چوونەوەی شێخ ئەبو سەعید کوڕی ئەبولخەیری میهنی وابوو بۆ سەر باوکی . دەگێڕنەوە کە"باوکی ئەبو سەعید, دۆستی سوڵتان مەحمودی غەزنەوی بوو, خانوویەکی بۆ دروستکردبوو ودەرو دیواری پڕکردبوو لە وێنەی مەحمودو لەشکرو فیلەکانی, شێخ ئەبو سەعید ئەوسا منداڵ بوو, گوتی: باوکە, بۆ منیش خانوویەك دروست بکە . ئەبو سەعید خانووەکەی پڕکرد لەوشەی (الله), باوکی گوتی بۆچی ئەوانە دەنووسی؟ گوتی: تۆ ناوی سوڵتانەکەی خۆت دەنووسی و منیش ناوی سوڵتانەکەی خۆم دەنووسم . ئەوە کاری لێکردو لەکردەی خۆی پەشیمان بووەوەو, وێنەکانی سڕییەوەو ئەویش دڵبەندی کاری کوڕەکەی بوو " .

بێگومان کاتێ خالید ئاغا سوپاسگوزاری نیعمەتی فەرمانڕەوایی بابان بوو, لە خزمەتیاندا بوو, شانازی بەپێگەو شوێنی خۆی دەکرد بەلای پاشاوە, شێخ عوسمانیش شانازیی بە مەولای خۆیەوە دەکردو, لەناخی دڵەوە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خوداوەند بوو . وئەو نیعمەتە کاتیانەو ئەو هێزو دەسەڵاتە سستانەی بە پولێك

نەدەکرێ, ورەنگە ئەم حاڵەتە گەلێ جار بووبێتە هۆی ناتەبایی نێوان باوك و کوڕ, بەڵێ:

هرکس بەقبلۀ کرد روی نیاز خودرا    هند و صنم پرستد من سرو نازخودرا

ئەمیر خەسرەوی دەهلەوی دەڵێت:

هر ملتی وراهی دینی وقبلەگاهی    من قبلە راست کردم برسوی کج کلاهی

زاناو ناودارەکانی ئەو سەردەمە لەدوو گوندی نزیکی تیوڵە, سەرقاڵی وانە وتنەوە بوون :مەلا ئیبراهیم لە گوندی بیاریۆ شێخ عەبدوڵلا لە گوندی خەرپانی . بەگومانی نزیك لە راستییەوە, دەتوانین بڵێین: کە شێخ عوسمان سوودی لە وانەوتنەوەی ئەو دوو گەورە پیاوە وەرگرتووە . ولەگەڵ لاوێکی گەلێ زیرەك و سیمانورانی و خواپەرست, بەناوی مەولانا خالید لەیەك حوجرەدا , دەرسیان خوێندووە .

شێخ عوسمان سەرەتای هەرزەکاری خۆی تا تەمەنی (31) ساڵی بە خواپەرستیو دەستەبەرکردنی زانستو گۆشەگیری و دابڕان و خۆشکاندنەوە بێناویی و هەژاری لە شوێنە پیرۆزەکانی کوردستانو لەبەغدا و مەزاری غەوسی گەورەی شێخ عەبدولقادری گەیلانییدا دەگوزەرێنێت . بەندە کتێبێکم هەبوو بەناوی (شرح شاە صدیقی هراتی بر کلمات شیخ عبدالقادر گیلانی) بەخەتی شێخ سراجودین عوسمان , کە لە کۆتایی کتێبەکەدا نووسیبووی: عوسمانی کوڕی خالیدی تیوڵەیی لە مەکتەبی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە 22ی رەجەبی 1226دا نووسیویەتی, مەخابن پیاوچاکێك داوای ئەو





کتێبەی لێکردم بۆ ماوەی (3)مانگ و تائێستا کە (13) ساڵ بەسەریدا دەگوزەرێت, هێشتا ئەو کتێبەی بۆ نەگێڕاومەتەوە . بەراستی گوێ رایەڵیی فرمانی : (ان اللە یامرکم ان تؤدّوا الامانات الی اهلها) هەروا دەبێت !! . مێژووی نووسینی ئەو کتێبە لە بەغدا بەخەتی شێخ عوسمان, هاوکاتە لەگەڵ گەڕانەوەی مەولانا خالید, لەگەشتی هیند بۆ شاری سلێمانی.

لەم پێشەکییەدا دەردەکەوێت کە: ساڵانێك بەر لە گەشتی مەولانا خالید بۆ وڵاتی هیند, شێخ عوسمان سەرقاڵی سلوك و هەوڵ و کۆشش بووە, دوور نییە کە تایبەتمەندیی پەروەردەکردنی ئەو لە لایەن مەولانا خالیدەوە بووبێت, چونکە ماك و خۆنەویستی و خواپەرستی شێخ عوسمان کارێکی کردبوو کە لەبەر چاوی باوکی کەوتبوو, تا ئەو رادەیەی کە باوکی بایەخی پێنەدەداو لە راستیدا نەیدەزانی کوڕێکی هەیە بەناوی عوسمان . دیارە دڵبەندیی شێخ سراجودین عوسمان بە گۆشە گیری و خۆدوور گرتن لە دونیاو سەرقاڵ بوون بە خودا پەرستییەوە, کاتێ کە مەولانا خالید لە گەشتی هیندستان بۆ سلێمانی گەڕایەوە, شتێکی نوێ نەبوو وچەندساڵ لەوەوبەر, واتە چەند ساڵێك بەر لە رووکردنی مەولانا خالید لە سۆفیگەریی و بەر لەیەکەم گەشتی بۆ حیجاز بووە .

سەبارەت بەئاشنایی نێوان مەولاناو سراجودین لە کتێبەکاندا ئاماژەی پێکراوە, لەلایەن نووسەرانی نەقشیبەندییەوە کە مەبەستی من لەم پێشەکییەدا, گێڕانەوەی ئەو داستانانە نییە . پێم وایە باشترین وتە ئەوەیانە کە راستە . مەولانا خالیدو شێخ عوسمان کە ئەوسا بەمەلا خالیدو مەلا عوسمان ناو دەبران سەردەمی هەرزەکاییو

فەقێیەتیان لە خوێندنگەی زانستە ئایینییەکانی بیارەو خەرپانیو خوێندنگەکانی تری شارەزووردا بەسەر بردووەو یەکتریان بەخواناسیو پیاوچاکی پێناسە کردووە, بەهۆی هاوبیرییانەوە, گەلێ هۆگری خۆشەویستیی بۆ خوداو لەخودادا بوونە . بۆیە گەشتەکەی مەولانا بۆ تیۆڵە, کە ئاماژەی پێ دەکەم, هەر لەم رووەوە بووە .

مەولانا خالید هەر ئەو ساڵەی لە هیند گەڕایەوە بۆ سلێمانی, بەپێی ئەو ئاشناییەی کە ئاماژەمان پێکرد, سەردانی تیۆڵەی کردو بوو بەمیوانی خالید ئاغا.

خالید ئاغا پێشوازیی لێکردوو گەلێ رێزی لێگرت, دوای هەندێ پشوودان, بەمەبەستی پەیداکردنی هاوڕێی دێرینو خواپەرستی خۆی, واتە شێخ عوسمان, داوای لەخالید ئاغا کرد کە چاوی بەکوڕەکانی بکەوێت . خالید ئاغا کوڕەکانی خۆی هێنایە خزمەتی مەولانا خالید, مەولانا لێی پرسی, جگە لەمانە کوڕی ترت هەیە ؟ گوتی بەڵێ, کوڕێکی گومڕاو دەربەدەرم هەیە کە بەکەڵکی ئەوە نایەت بیهێنمە خزمەتی مەولانا. مەولانا گوتی : ناشێ ئەو کوڕە دەربەدەرەی ئێوە عوسمان بێت ؟ گوتی: بەڵێ .

ئاغا کوڕەکەی لەبەغداوە هێنایەوەو بەمەولانا خالیدی سپارد .

بەپێی ئامۆژگاریی پیرەکەی خۆی مەولانا خالید, شێخ عوسمان مزگەوتی گوندی بیارەی کرد بەشوێنی خواپەرستیو زیکرو فیکری خۆی, مەولانا هەردەم چاودێریی دەکرد, ئەویش بەهۆی کارەکەیەوە, هێندە گوێی بەپلەو پایەو ئەم دونیاو سەروەتو سامانی باوکی نەدەدا . تەمەنێکی بەسلوکو هەوڵو مەشقو خۆڕاهێنان لەسەر برسێتیو شەونخونیو قەناعەتکردن بەخواردنو سیپاڵی کەمو



مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

حەلاڵو خواپەرستیو پاکژکردنی دەروون بەسەر دەبرد . لەئاکامی پاکیو راستگۆیی کە لەناخیدا هەبوو, لوتفو عینایەتی پرشکۆی بۆخۆی دەستەبەرکرد, وردە وردە پایەی بەرز بووەوەو, هەر جارێ شێخ ئەبوسەعیدی کوڕی ئەبولخەیر واتەنی: هەموو بەشێك لە جەستەی بانگی(الله الله)ی لێبەرزدەبووەوە, تاکار گەیشتە ئەوەی کەدیگووت: کاتێ شەوان نوێژی تەهەججودم دەخوێند: واشهد ان محمدا رسول الله, حەزرەتی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت, بەجەستە دەهاتە بەرچاومو وەلامی دەدامەوەو دەیگوت: صدقت .

شێخ سراجودین عوسمان لەژێر چاودێریو پەروەردەکردنی پیری رۆشن ویژدانی خۆی مەولانا خالیددا, لە عینایەتی خوداوەند بەهرەمەند بوو وبەپلەی بەرزی عیرفان گەیشت, کەباوکی کۆچی دوایی کرد, بۆ زێدی خۆی تویێڵە گەڕایەوە, لەوێ بەپارەو داهاتێکی حەلاڵ خانەقایەکی دروست کردو خوداوەندیش لەنێوان خەڵکی ناوچەکەدا, رێزداری کرد . وخەڵکێکی زۆر لەفارسو تورکو تاجیکو عەرەبو کورد روویان تێکرد . ولەزانستو رەفتارو کرداری پیرۆزی بەهرەمەند بوون .

مەخابن شێخ سراجودین عوسمان, لەمەسەلەی ئیرشاددا مێملی هەبوو, گەلێ لەعارفانی هاوچەرخو جێنشینی مەولانا خالید رکابەرایەتییان کرد . لەوانە حاجی محەمەدی کوردستانیو حاجی عەبدولکەریمی کوڕی, هەروەها شێخ ئەحمەدی ناسراو بە ئەربیلی و شێخ عەبدولفەتاح . ئەمانە کەچاویان بەجەماوەری ئیرشادو شایستەییو توانایی و دەرکەوتنی کەرامەتی شێخ سراجودین عوسمان دەکەوت, کوێراییان دادەهاتو کورەی بەخیلییان کڵپەی

دەسەند, دەستیان دەکرد بە زەمو پروپاگەندەی دژ بەشێخ سراجودین.

ئاشکرابوو کە شێخ سراجودین بەوئاکاری لەخۆبوونەوەو ئارامییەی کە گوزارشتیان لەبەرزی پێگەی ئایینی وعرفانی دەکرد, ئەو هەمو قسەو قسەڵۆك و دوژمنکارییانەی پشت گوێ دەخست, لەبەرامبەردا, بەباشە ناوی هاوڕێیانی تەریقەتی دەبردو لەبەرامبەریاندا, لەخۆدەبووەوەو ڕێزی فراوانی لێدەگرتن .

هۆکاری دوژمنایەتی حاجی محەمەدی کوردستانی و کوڕەکەی ئەوەبوو کە: شێخ سراجودین لە رووی خۆشەویستی و دڵپاکی دەروونی, سەبارەت بە یەکگرتنەوەی لەگەڵ مەلا ئەحمەدی کۆڵە سارەیی (مەولانا ئەحمەد) کە یەکێك بوو لە جێنشینە کارامەکانی مەولانا خالید, لەکاری ئیرشاددا سازگار بوو . هەرکەمەلا ئەحمەد هاتە ناو ئیرشادەوەو دەریخست کەلەم کارە پڕمەترسییەدا , پیاوێکی شایستەو بەتوانا لە ئارادایە, بەم پێیە زۆربەی موریدەکانی حاجی محەمەدی کوردستانی روویان لەو کرد . حاجی محەمەدی کوردستانی چالاکیی شێخ سراجودینی بە پیلانێك دەزانی کە بێ بازاڕی شێخایەتی ئەوی لێکەوتبۆوە . تامردنی ئەو گرێیەی لەدڵدا بوو, دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد, کوڕەکەی حاجی عەبدولکەریم درێژەی بەو رقەداو شێوازی باوکی گرتە بەر, چەندە ساویلکەن ئەو کەسانەی کە لەرێگەی سۆفیگەرییەوە, دەکەونە دوای شکارکردنی دونیا , وبەهۆی زاڵبوونی هەوەس, دەکەونە دوژمنایەتی کردنی دۆستانی خودا, لەپێناوی داکۆکی لەکاروباری دونیا:

وماذا بعد الحقّ الاّ الضلال .





هۆکاری دوژمنکاریی شێخ ئەحمەدی ئەربیلی لەگەڵ شێخ سراجودین ئەوەبوو کە شێخی ناوبراو لە تەریقەت وسۆفیگەریی و تەنانەت لە بەرێوەبردنی کاروبارە رواڵەتییەکانی خانەقادا, توانایەکی ئەو تۆی نەبوو, هێندە سست بوو کە کوڕەکەشی گوێڕایەڵی نەدەبوو .

بەرێکەوت لەو ماوەیەدا, تاقمێك لەخەڵکی سلێمانی تەریقەتیان لە شێخ سراجودین وەرگرت, شێخ سراجودین دوان لەو تاقمە بەناوی شێخ لوتفوڵلاو مەلا عوسمانی باڵخی راسپارد کە حەڵقەی خەتمو زیکرو ئیرشادی خەڵك وبەپەیرەویی کردن لە شێخ ئەحمەدی ئەربیلی پیادە بکەن, کاتێ گەڕانەوە بۆ سلێمانی وویستیان لەخانەقادا دەست بەکار بن, شێخ ئەحمەد کە شێخی ئەو خانەقایە بوو, رێگەی پێنەدان, ئەوانیش ناچاربوون لەخانەقای مەلا عوسماندا دەست بەکار بن, وتاقمێکی زۆر لە دانیشتوانی سلێمانی لە دەوریان کۆبوونەوەوهێدی هێدی کالاّکەی شێخ ئەحمەدی ئەربیلی, بازاڕی خۆی لەدەست دا, ئەم دیاردەیە بەلای شێخی ناوبراوەوە گەلێ قورس بوو, هەوڵیدا لای ئەحمەد پاشای بابان دژی شێخ لوتفوڵلاّ و مەلا عوسمان دەست بەکاربێت, بەو هومێدەی کەئەحمەد پاشا ڕێگە نەدات بەو دوانە کاری ئیرشاد ئەنجام بدەن و سووکایەتیان پێبکات . ئەم کارە لەسەردەمی سلێمان پاشادا رووی‌دا .

ئەحمەد پاشا کە کوڕە گەورەی بوو, بەجێگری باوکی بەخواستی خۆی فرمانی دەکرد, ئەحمەد پاشا بڕیاری‌دا لەو بارەوە, نامەیەك بۆ شێخ سراجودین بنووسێت و دوای وەرگرتنەوەی وەلاّمی نامەکە, ئەوسا بڕیاری خۆی بدات. تا بەناوەرۆکێکی لێکچووی ئەمەی لای خوارەوە, نامەیەکی بۆ شێخ نارد: حەزرەتی شێخ, بەڕێزان شێخ

لوتفوڵڵاو مەلا عوسمانتان کردووە بەجێنشین و ڕەوانەی ئێرەتان کردوون، ئەگەرچی لەراستیدا دەروازەی زانستییان بۆ خوازیارانی ئەم دەڤەرە ئاوەڵا کردووە، بەڵام هەروەکو ئێمە بیستمان، حەزرەتی مەولانا خالید کەپیری ئێوەیە، وەسیەتی کردبووکەلەهەر شارێکدا جێنشینی ئەوی لێبێت، بۆ جیٚنشینێکی تر نییە رووبکاتە ئەو شوێنەو دڵزویری بکات، بۆیە پێتان رادەگەیەنین کە: ئەگەر ئێوە خۆتان بەموریدی ئەو حەزرەتە دادەنێن، دەبیٚ ڕێگە بەو دووانە نەدەن کاری ئیرشاد ئەنجام بدەن و بیانگێڕیتەوە بۆ لای خۆت، ئەینا کارلەکار دەترازێت، لەگەڵ ڕێزدا )).

هەر کەنامەکە بەدەستی گەیشت و خوێندییەوە، فرمانی کرد وەڵامی نامەکەم بەم جۆرە بۆ بنووسن: (لەلایەن بەڕێزتانەوە سەرۆکی ئەمیران و فەخری گەورە پیاوانەوە، فەرمانێك بۆ خزمەتکارانی هەژاران دەرچوو، لەوبارەوە کە هەردووبەڕێزو خزمەتگوزار لەبواری شەریعەت و تەریقەت و ئیرشاددا، شێخ لوتفوڵڵاو مەلا عوسمان کەبەجێنشینی و جێگری پیرانی تەریقەتی بەرزی نەقشبەندی(خودا رازداری بکات)وبەنوێنەریی ئەم مەڵبەندەی نەزانی و سەرگەردانی کە سەرقاڵی کاری ئیرشادی بەندەکانی خودان، بەندە ئەو دووپیاوە لە ئەنجام دانی ئەو کارە بەرزو پیرۆزە رابگرم و بۆ لای خۆم بیانبەمەوەو سەرپێچی دەرگای فرمانی خودا بکەم، بەپێی تێبینی و داوای چەند بەندەیەکی خودا، لە راستیدا پابەند بوون بەفرمانی دەسەڵاتداران پێویستە، بەڵام بەمەرجێك ئەو فەرمانە





بەپێچەوانەی شەریعەتەوە نەبێت، دەبێت بەئینسافەوە رەفتار بکرێت و لەچ شەریعەت و میللەتێکدا بینیوتە کەڕێگە بەهاندانی خەڵك بۆ ئەنجامی کاری چاکەو ئەنجام نەدانی کاری خراپە نەدرێت و تەنیا تایبەت بکرێت بەکەسێکەوە لەشارێکدا، خودا نەخواستە حەزرەتی مەولانا(خودا رازداری بکات) بەپێچەوانەی شەرعەوە کارییێکی ئەنجام دابێت، چونکە ئەو زاتە، سەرتاپا شەریعەت بوو، وەکو دەروێشە نەزانەکان، جیاوازیی لە نێوان شەریعەت و تەریقەتدا قایل نەدەبوو، جگە لەوەی، ئەم کارە دەبێتە هۆی دەرگاداخستن بەرووی ئەو تەریقەتە پایەبەرزەدا، ولەترسی ئەوەی نەبادا بەپلەی ئیرشاد گەیشتوەو، شاربەدەری بکەن و سفرەی ئارەزووی چوونە ناوتەریقەتەوە بپێچێتەوە، لایەنی بەدی ئەم وتەیە گەلیٚ روون و ئاشکرایەو نارەوابوونی بەلای وردبین و ئاگایانەوە دیارە، بۆیە ئێمە ناتوانین لەم کارەدا هاوکاریی بکەین و بەڕێزتان لەوکارە سەر پشکن .لەگەڵ ڕێزدا) ناوەڕۆکی نامەکەی شێخ سراجودین کە لایەنی حەق بوو، ئەحمەد پادشای لەکاری خۆی پەشیمان کردەوەو هێنایەسەرباری خۆشەویستی و هاودەمی و گەردوخاکی هەوڵەکانی شێخ ئەحمەدی ئەربیلی لەسەرلاپەڕەی یادیدا رەوییەوە. دوای کۆچی دوایی سلێمان پاشا، حکومەتی سلێمانی لەگەڵیدا میانەیان باشتر بوو، شێخ سراجودینی بانگێشت کرد بۆ سەردانی سلێمانی و بەو پەڕی ڕێزەوە،

پێشوازییان لێی کرد, لەئاکامدا بینینی ئەم بارودۆخە لەلایەن شێخ ئەحمەدی ئەربیلی بەناچارییەوەو خانەقای سلێمانی سپارد بە شێخ سراجودین و خۆشی دەستی کێشایەوە . عەبدوڵڵا پاشای برای ئەحمەد پاشا کەلەو کاتەدا میر بوو واتە کاندیدی حکومەت بوو وبەپێی داب و نەریتی بنەماڵە, نیشتە جێی قەرەداغ بوو . لەقەرەداغدا خانەقایەکی دروست کردو شێخ ئەحمەد ئەربیلی بەشێخی خانەقاکە دانا . بەڵام شێخی ناوبراو لەسەر دژایەتی کردنی خۆی بۆ شێخ سراجودین مایەوەو هەردەم لەهەل دەگەڕا کە دووبارە خانەقای سلێمانی بەدەست بهێنێتەوە . تا ئەوەی ئەحمەد پاشا لەسەر کار لابراو حکومەتی سلێمانی بەعەبدوڵڵا پاشا سپێردرا, هەردوای ئەم گۆڕانکارییە, شێخ ئەحمەدی ئەربیلی بەئارەزووی هەمیشەیی خۆی گەیشت تا ببێتە شێخی خانەقای سلێمانی . لەم کەینو بەینەدا, شێخ ئەحمەد ئەربیلی و دۆست و پشتیوانی نزیکی, واتە شێخ عەبدولفەتاح بەشادی کاتیان بەسەر دەبرد . بەڵام دوای دوورخستنەوەی عەبدوڵڵا پاشا, دۆخەکەیان تێکچوو, بەهۆی ئەم رووداوەوە, شێخ ئەحمەدی ئەربیلی بەناچارییەوە لەگەڵ شێخ سراجودیندا, ئاشت بۆوەو میانەی لەگەڵیدا باش کردو بەرواڵەت هیچ لەدڵیدا نەما. بەڵام رق و کینەی شێخ عەبدولفەتاح لە شێخ سراجودین ئەوەبوو, کەدوای ئەوەی شێخ سراجودین لەسەرداوای ئەحمەد پاشای بابان, شێخایەتی خانەقای سلێمانی

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

وەرگرت و جەماوەر لەدەوری کۆبوونەوە و لەسەر دەستی ئەو تەریقەتیان وەرگرت, شێخ عەبدولفەتاح بەوەی خۆی بەجێگرو جێنشینی بەرماڵی مەولانا خالید دەزانی, چاوەڕوانی ئەوەبوو کە شێخ سراجودینیش وەکو موریدەکانی تر, فرمانەکانی ئەو جێبەجێ بکات. دیارە شێخی ناوبراو لە ئاستێکدا نەبوو کەبتوانێت دڵی کەسێکی وەکو سراجودین بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە, وتەنیا بەپشت بەستن بەو توانایەی لەبواری دونیادا هەیبوو, دەیویست پایەی مەولانا خالید بەدەست بهێنێت .

بۆیە سراجودین, تاعەتی ئەوی بەتاعەتی دونیا پەرستان ئەژمار دەکردو سەری لەبەرامبەردا دانەنەواندەوە لەو لاشەوە شێخ عەبدولفەتاح لەکاروباری دنیادا, پیاوێکی چالاک و شارەزا بوو, هەوڵی بێ وچانی دەدا, لەنێو خەڵکی تایبەت و گشتیدا, شێخ سراجودین بێ رێزو سووک بکات, بەڵام لەبەر ئەوەی شێخ ئەحمەد پاشا شێخ سراجودینی بەزانای غەیب دەزانی, خەنەی دوژمنایەتی ئەو, لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەحمەد پاشادا, رەنگی نەدایەوە .

شێخ عەبدولفەتاح لەسەر بەزمو بالۆرەی خۆی مایەوە, تائەوەی حکومەت کەوتە دەستی عەبدوڵڵا پاشا, لەو دەرفەتەدا, درەختی ئارەزووی شێخ عەبدولفەتاحیش بەری گرت و بەئاوەتەکانی خۆی گەیشت و شێخ ئەحمەدی ئەربیلی بەشێخی خانەقای سلێمانی دانرا, ودوای ئەوەی عەبدوڵڵا پاشا لەسەر کار لابرا, لەگەڵ شێخ ئەحمەدی ئەربیلیش کەوتە دوژمنایەتی, وبۆخەڵکی بەویژدان روون بۆوە کە دوژمنکارییەکانی لەگەڵ شێخ سراجودین و جێنشینانی تری مەولانا

خالیددا, تەنیا بەمەبەستی بەدەستهێنانی پایەو پلەو پۆست بووە. سەرچاوەی داوای شێخ عەبدولفەتاح بۆ جێنشینی مەولانا خالید ئەوەیە کە شێخ ئیسماعیلی غەزی لەباسی کۆچی دوایی مەولانا خالیدا نووسیویەتی و مەلاحامید وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی: (( ... تائەوەی سەرلەبەیانی رۆژی سێشەممە, یەکێك لەموریدانی ئەو حەزرەتە لەدەرگای‌دا . کاتێ هاتمە دەرەوە, گوتی, حەزرەت تۆی دەوێت, بەپەلە خۆم پێ‌گەیاندو بەدیداری شاد بووم, روانی پێمداو فەرمووی: بۆچی درەنگ هاتی؟ گوتم گەورەم حەددی ئەوم نەبوو, لەخۆوە بێمە ناو حەرەم, فەرمووی ئەگەر لێرە بوویتایە, ئەوەی کە دەمویست, ئەڵبەتە ئەمڕۆ دەمەو بەیان بهاتیتایە بۆ ئێرە .لە وتەکانیدا وابەخەیاڵمدا هات کە ئارەزووی زیارەتی پیرزادەکانی هەبێت (ئەو دوو فەرزەندەی بە نەخۆشی تاعوون مردبوون)و دەیەوێت منیش لە خزمەتیدا بم, پێم گوت ئارەزوی زیارەتتان هەیە؟ فەرمووی بۆ شوێنێك ناڕۆم, تەنیا بۆ لای کوڕەکەم بەهائودین نەبێت , پێم راگەیاند کە ئەوێ بەهۆی بەرزی پلەی گەرماوە, بەکەڵکی ئەوە نایەت تیدا بمێنمەوە . فەرموی هەر ئەوەندە بگەمە ئەوێ, ئیتر گەرمی خۆرو ئاوو هەوا کاریگەرییان لەسەر من نابێت, رووی کردە هەیوانی لای رۆژهەڵاتی حەرەمو داوای لەمنیش کرد کە دوای بکەوم.

وەکو سێبەر بەدوی ئەو خۆرە تازە هەڵهاتووە کەوتم, تاگەیشتە بەردەم دەرگای کتێبخانەکەو لەوێ دادەنیشت و داوای لێکردم منیش دابنیشم, بەپێی فرمانی خۆی لە خزمەتیدا دانیشتم و چاوەڕوانی فەرمانی ئەو زاتە بووم, رووی موبارەکی تێکردمو فەرمووی: گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم, وای ئەگەر سەرپێچی لەفرمانەکانم بکەیت‌و



تابلۆی خەیاڵ لەو ئامۆژگارییانە بە ئاوی خافڵبوون بشۆیت, بزانە و ئاگاداربە من جێنشین‌و جێگری بەرماڵی خۆم‌و ئیرشادی دوای خۆم‌و دەمڕاستی فەرزەندەکانی خۆم‌و چاودێری نووسراوەکانی خۆم‌و راپەڕێنەری ئامۆژگارییەکانی خۆم دانا , ئیسماعیلی ئەنارانی‌و دوای ئەو محەمەد ناسح‌و دوای ئەو عەبدولفەتاح‌و دواتریش تۆ(شێخ ئیسماعیلی غەزی...) )) .

دواتر مەلا حامید لەکتێبی (ریاض المشتاقین) لە جێگری‌و جێنشینی شێخ عەبدولفەتاح دەستی کێشایەوەو ئامۆژگارییەکی مەولانا خالیدی بەم جۆرە راڤە کرد :((کەواتە هەر کاتێ موڕادی حەزرەتی مەولانا (خودا رازداری بکات) ئەوە بێت کە دوای من شێخ ئیسماعیلی ئەنارانی جێگرو جێنشینە, ودوای جێنشینی‌و کۆچی دوایی ئەو, شێخ محەمەد ناسیح‌و دوای جێنشینی ئەو وکۆچی دوایی,شێخ عەبدولفەتاح‌و, دوای جێنشینی‌و مردنی, سەید ئیسماعیل‌و داواکردنی جێنشینی لەلایەن هەریەکێکیانەوە بۆ خۆی, چ مانایەکی هەیە, وهەروەها شێخ ئیسماعیل چۆن سەرپێچی لە فرمانی ئەو حەزرەتەی کردو لەکاتێکدا شێخ عەبدولفەتاح و سەید ئسماعیل, شێخ عەبدوڵلای هەروی کردووە بەجێنشین, بەڵکو مانای ئەو پەرەگرافە بەم شێوەیە: دوای کۆچی دوایی من, ئەگەر ئەو چوار کەسە لە ژیاندا بوون, ئەوا شێخ ئیسماعیل لەپێش هەموویانەوە دەبێت . ))

وئەگەر ئەو لە ژیاندا نەبوو, سێ کەسەکەی تر لەژیاندا بوون, ئەوا شێخ محەمەد ناسیح لەپێشەوەدایە, وئەگەر ئەویش لەژیاندا نەما,

لەنێوانی ئەو دووکەسەدا, شێخ عەبدولفەتاح لەپێشەوەیەو خوداوەند ئاگاداری راستییەکانە)) .

مەلا حامید دوای چەندین لاپەڕە باسو درێژبڕیو بەکاربردنی کێشو سەروا, دەڵێت: (( بەندە هەموو جێنشینانی حەزرەتی مەولانا (خودا رازداری بکات) گەورە دەبینمو خاوەنی بەرەکەتن, وشەتڵی بڕوای هەموویان لەدڵی خۆمدا جێ دەکەمەوە, کە هەروەکو ئەکسیر, تایبەتمەندییو مەزەندەی ئەو حەزرەتە بەهەڵەدا نەچووە, مەبەستی حەزرەت ئەوەیە کە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە مامەڵە لەگەڵ جەنابی شێخدا ناکەن و بایەخ بەکۆڕو کۆبوونەوەکان نادەنو تانەو تەشەر دەدەن, هەرجارێ پیاو چاکان فەرموویانە, هەرکەسێ رەفتاری بەد لەگەڵ پیری تۆدا بکاتو تۆ چاکەی لەگەڵدا بکەیت, سەگ لەتۆ باشترە)) .



بەندە لەم دەستو بەندەدا بێلایەنم, بەبێ ئەوەی بکەومە ژێر کاریگەریی نووسینەکانی مەلا حامیدو ئەوانی ترەوە . دوای رەتبوونی (110)ساڵ بەسەر کۆچی دوایی شێخ سراجودین, بە بڕوایەکی تەواوەوە رایدەگەیەنم کە ئەو بەپێی (من کان للە فقد کان اللّه له), لەئاکامی راستگۆیی بەرەچەڵەكو بەهرەی خودی گەیشتۆتە بەرزترین پلەی عیرفانو شایانی جێنشینی بووە . ئیتر ئەگەر سەفارشتێك دەربارەی ئەو کرابێت یان نەکرابێت, چ لەمەسەلەکە دەگۆڕێت, ئەوەی کەراستە لەم رێگەیەدا, ئەوەیە کە تەریقەتی راست بەمەبەست بگات, ئەویش بەبێگومان گەیشتبوو, ئیتر هیچ پێویست بەداکۆکی نووسینو زارەکی ناکات (تلك اثارة تدلّ علیه) .



یەکێك لە موریدان بەهۆی ستەمکاریی کەسێکەوە, سکاڵانامەیەکی بۆ شێخ سراجودین نووسی, شێخ لە وەڵامدا نووسی کە :

قفا خوریم وملامت کشیم وخوش باشیم    کەدر طریقۀ ماکافریست رنجیدن

ئەو پیاوێکی خوا پەرستو بێنەفس و بێ دەعیە بوو, رەفتاری تا بڵێیت بەرز بوو, جارێکیان سەرمای بوو, شێخ بەهائودین محەمەدی فەرزەندی لە فنجانێکی چینیدا, چای بۆ برد, پرسی کە ئەوە چییە ؟ گوتی چام بۆ هێناوی .گوتی: دەتەوێت من بخەیتە ریزی فیرعۆنەکانەوە, من چیم داوە لەفەخفوریو بلوور . دواتر چاکەیان کردە کاسەیەکی تەختەوە, ئەوسا خواردییەوە .

هەروەها جارێکیان حاجی شێخ عەبدورەحمان/ وەفا-کورەکەی تری-دووجووت چرا بەمۆمی رۆشنەوەی هێنا بۆماڵیان, شێخ فرمانی کرد ئەو مۆمانە ببەنە دەرەوە, ولەبری ئەو چرایانە, چرای رۆنی گەرچکی, وەکو جاران داگیرساند.

شێخ سراجودین عوسمان شارەزایی تەواوی لە زانستیەکانی سوەریو شەرعیدا هەبوو, بەو هەمووسەرقاڵییەی خۆیەوە لە شیعرو ئەدەبدا, زەوقو سەلیقەی بەرزی هەبوو, ئەم سێدێرە بەڵگەن :

هەرجاکەمنو یار بهم باز رسیدیم    ازبیم بداندیش لب خویش گزیدیم
بی واسطۀ گوشو زبان از طرف دل    بسیار سخن بود کە گفتیم وشنیدیم
شیرزاد بیشۀ عشقم قوی درکارخود    کوحریفی گو بیا تازوربازو بنگریم

شێخ سراجودین عوسمان لەنیوەشەوی سێشەممەی 13ی مانگی شەوالی 1283 کۆچی, دوای (88)ساڵ تەمەن, کۆچیدوایی کرد(خودا رازداری بکات), لەکۆچی دواییدا چەندین کەس شیعری ماتەمینییان

هۆنيوەتـەوە, لەوانـە شيعرێكی فارسيی مەلاحاميـدی كاتب و بەشێك لەشيعرێكی مەولەوی سەيد عەبدورەحيمی مەعدوم, بڵاودەكەينەوە :

امشب كه جهان يكسر پرنالەو فريارداست　　　عالـــــم همه درهم شد تاباز چەغم زاداست
آشوب قيامت خــــاست بازرمهٔ توحيد　　　كـــــه حضرت شيخ ما در حلقهٔ اوراداست
نیاين ونه آن باشد كــــان پادشه معنی　　　آهنگ سفر فرمود وعزمش عــــدم آباداست
فريـــــــاد مريدانش غوغای شهيدانش　　　در دردفراق اواز خـــــــــــاطر ناشاداست
الحق كەوجود اوچون سدّ سكندر بــود　　　قرنی است كەدر اسلام اين رخته نيفتاد است
زين پيش كه نطق من دعوی فصاحت داشت　　　در راه ثنای اوبیراحلـــــــــه وزاداست
حــيرت زدەم امــــاً در دفتر اوصافش　　　از فكر كەوصّاف است اين قطعه مرا ياد است
سهل است اگر گويم سردفتر ابراراست　　　جهل اســـت اگــرخوانم سر حلقهٔ اوتـاداست
افراد همه چـــــاكـــراو برهمگی سرور　　　اقطاب همەشاگرداو برهمـــــه استاداســـت
صديق صفت صادق فاروق نمط عاشق　　　عثمان دوم باشد اين رتبهٔ خــــــداداد است
فرزند علی خوانش زيراكه بوقت خـود　　　كس باب ولايت رااين مـــــرتبه نگشاد است
يارب تو ببخش اورا در حـضرت قدس خويش　　　آن مقعد صدقی كومخصوص بـامجاد است
هـــم نيك وبدمـــــــاراجمله بطفيـل او　　　می بخش وعنايت كن زان روی كه معتاد است
نصف شب سەشنبه ثالث عشر شوّال　　　اين واقعه عظمی وين هائلــــــه رخ داد است
درفكر شدم كآيا تاريخ چەبنويســم　　　ناگاه خرد گفتا : ((قطـــــب ره ارشاد است))
تاريخ ظهورش نيزچون مظهر كل باشد　　　پس سن شريف اوهشت ازپـــــیهشتاداست
رسم است پسر دايم مرآت پدر بـــاشد　　　فضلی كـــــه پدر دارد تفصيل در اولاد است
اولاد كرامش رايارب توحمايت كـــــن　　　درظلّ عنايت تاآن روزكـــــــــه ميعاد است

اسرار ولايت را درجمله مضاعف ساز
همچون بريك حبّەكه هفتصد افتاد است



**شيعری ماتەمينی سەيد عەبدورەحيم ( مەعدوم ) :**

ألا تــــــری الی التي بنهيتي　　　ومهجتي, مــن غمّة البليّة
لونزلت منهـــــا علی الثوابت　　　او السمـــــالاتنثرث وانشقّت
طورتهی ام قبّة القطب لهــــا　　　أنوار بــــاریٔ الوری تجلّت



بل بــــــــان بون بينها وبينه　　　ازدكّ ذاو هــــــذه أستقرّت
أم فلك الاعظم دائـــــــر علی　　　قطبه بالفوائض اليوميــــــة
لكنه كمـــا تــــــری مختلف　　　وذي عليهـــا الأمم اجتمعت
ان لم تكن مشبّهابها السمـــا　　　فليست السماء ذات السعـة
لاحت كمشكواة بهـا مصباح　　　وذلك المصباح في زجاجــة
نعم بها سراج دين المصطنع　　　ضياء اهل الشرع والطريقة

تا دەگاتە :

تحركّت امواج بحر الاحــد　　　اضطربت ترتفع التطمت
فانفجرت مياهه فقد جـرت　　　بكل عبر وبكل شرعـــــة
فسقت الزرع الی ان استوی　　　وبعدما اضطربت وسقت

1283

((هدء اضطراب بحر الواحد))　　　بذا بدا تاريخ عام الهجرة

شێخ سـراجودين عوسمـان, هـەولێكی زۆری دا, لەپـەروەردەكردنی منداڵەكانيـدا, چـوار فەرزەندەكـەی كەلـەم پێشـەكييەدا, بەخواسـتی خـــودا, ئاماژەيـــان پێدەكـــەين, كەبەخشـــڵی زانســـت و ئـــەدەب رازاندييانييـەوە . ولەئاكامـدا بنەماڵـەی ئـەو لـە پێشـكەوتنی زانسـت و مەعريفەی ئيسلامييدا رۆڵێكی شايستەيان هـەبوو, وئـەو شانازييەی لە رووی خزمەت كردن بە بڵاوكردنەوەی زانستەكانی شەرعەوە بۆ ئەو بنەماڵەيە بڕاوەتـەوە, كـەمتر بووە بـە نسيبی بنەماڵـەكانی تـری بواری سـۆفيگەريی, جگـە لـەوەی زيـاتر لـە نێـوان زانـاو ڕواڵەتييـەكان و سۆفييەكاندا ناتەبايی لە ئارادا بوو, ئەوان لەنێوان ئەم دووگروپـەدا , تەباييان بەرقەرار دەكردو تا ئێستاكە (110)ساڵ بەسەر كۆچی دوايی

سـراجودیندا دەگوزەرێـت, كاریگـەریی ئـەو لـەناو بنەماڵـەدا دیـارە, وئەمەش خۆی یەكێكە لە نیشانەكانی شكۆمەندیی ئەو پیاو چاكە .

شـێخ سـراجودین لـە ئامۆژگارییـە ئاشـكراكانی خۆیـدا, شـێخ بـەهائودین محەمــەدو شـێخ عەبــدورەحمانی وەفــای لــە بــواری سۆفیگەریی و عیرفاندا, گەیاندبووە ئاستی ئیرشاد, ئەگەرچی هێشتا لاو بــوون, وەكــو دوو شــێخ بــە موریــدانی خــۆی ناســاندبوونیو ئامۆژگاریی دەكـردن كـە گوێبیسـتی فرمانـەكانی ئـەو دوانـە بـن, لـە رێگەی ناوەرۆكی ئەم ئامۆژگارییانەوە, دەردەكەوێت كە باوك هەر دوو كورەكەی شایانی پێگەی جێنشینی خۆی دەستنیشان كردبوو, ئەم دووبرایــە لەســەردەمی ژیــانی باوكیانــدا, بەرامبــەر بەیــەكتر خۆشەویسـتییان هــەبوو وبــەرێزەوە تەماشــای یــەكتریان دەكــرد. بەرواڵـەت و نـاوەرۆك گـەلێ تـەبا بـوون, بـەنۆرە كـۆڕی زیكـرو خـەتمو پــەوەردەكردنی موریــدانیان سەرپەرشــتی دەكــرد . لــە راســتیدا بەخۆشەویسـتیو هـاودەمی خـودادادی دەژیـان, بـۆ نموونـە شـێخ بـەهائودین محەمـەد بـەم شـێوەیە یـادی شـێخ عەبـدورەحمانی وەفـا دەكات:

تابه آن بالابلادل مبتلا گـردیده اســـت — رشـــــته ٔ مهر وفارا از جهان ببریده است
دل كەتوغ... [illegible] — [illegible]
دیده سوی غیر روی دوست بگشودن خطاست — جزخیـالش ره بـەدل دادن كمـال ابتلاسـت
ابیـاریّ ریـــــاض جـان بـەآگـاهی شـود — بارو برگ باغ دل نسیان یاد ماسوی است
درس ووحشت را زهستی میدهد وضع حباب — ساز اسباب بقایش غوطه در بحـر فنا است
بی خودی از عالم, اندر بزم وصلت رەدهـد — آن كـاه ازخود رفتنش پیك وصال كهرباست
رسوی حـــق درخاكسـاری میتـوان رەیـافتن — گونیسـتی درشـهرما تحصیل نقد مّدعا است
بابادبـان كشتی جـان صحبت اهـل دل است، — ازمذكر حق مربحر هستی رابجای ناخدا استت
چـــاك دل رارشـته ٔ مـــریم رفونتـوان نمـودكسی — مرهم داغ وفـا موقـوف وصـل بوالبها است
جامـه ٔجـان بـی وصـال قـامت دل جـوی او — برتن چون كـاه باللـه كوەاندوە وبلا است





شـێخ عەبـدورەحمان / وەفـا بـەم جـۆرە یـادی شـێخ بـەهائودین محەمەد دەكاتەوە:

بەم هەموو ئاماژەو هێماو ئامۆژگارییو خۆشەویستییەوە, دەبینین كە دوای كۆچی دوایی شێخ سراجودین, شاعیرو عارف گەورەی ئێمە, حاجی شێخ عەبدورەحمانی وەفا, پێگەو شوێنی خۆی, واتە خانـەقای تیـوڵی بـەجێدەهێڵێت كـە تێیـدا گـەلێ سـوودی وەرگرتبـوو, رووی لـە بەغـدا كـردو دوای ماوەیـەك كـە لەخزمـەتی بارەگـای عەبـدولقادری گەیلانیـدا بـوو, كۆچـی دوایـی كـرد . هاوسـەرو تـاجودینی كـوڕە تاكانەكـەی كەوتنـە شـاری هـەولێرەوە, وشـێخ بـەهائودین محەمـەدی بــرای, بووبــەجێگری بــاوكی, لــە كاتێكــدا وەفــا ســەبارەت بەپەروەردەكردنی موریدان, شتێكی لەبەهائودین كەمتر نەبوو, بەڵكو بەپێی وتەی چەند كەسێكی ناودار, گەلێ بەتواناتر بوو !

لێرەدا ئەوەی مەلا حامید سەبارەت بەژیاننامەو سەرەتای ژیانی شــێخ ســراجودین عوسمــان نووســیویەتی, لــە كتــێبی (ریــاض المشتاقین)دا, بڵاودەكەینەوە:

((لەبەیانی حاڵەتی ئەو ئەستێرە گەشەی ڕێنموونکردن, هەر لەسەرەتای هەڵهاتنیەوە تاگەیشتنی بەبەرزترین پایەی ویلایەت: شێخ عوسمانی ناسراو بە سراجودین لە تیۆڵە لەدایك بووەو نەسەبی شارەزوورییەو ئایینزاکەی شافعییەو بیرو باوەڕی ئەشعەرییەو تەریقەتی نەقشبەندی موجەدیدی خالیدییە, مێژووی لەدایك بوونی نووری باغی ڕێنمونیکردن‌و نووری دیدەی ویلایەت‌و مانگی بورجی پۆلێنکردنی کۆتایی لەسەرەتادا ,هەروەکو تاوتوێم کردووەو لە زمانی موبارەکی خۆی بیستوومە, لەوساڵەدا بووە کەمەحمود پاشای باوکیعەبدورەحمان پاشا, لەدەربەندی جەمرە لەگەڵ وەزیری بەغدادا, ڕووبەڕووی یەکتر وەستانەوە, وبەبڕیاری وتەی کەسانێك کە مێژووناسن, ئەو ساڵە ساڵی 1195 بووە, باوکی خوالێخۆشبووی ئەگەرچی ڕوولەخودا نەبووەو دەرباربووەو بەفەرمانی دەسەڵاتدارانی هاوچەرخی خۆی, گوندی تیوڵەی خستۆتە ژێر ڕکێفی حکومەتەوە, بەڵام ئەم پیاوە خۆشبەختە هەر لەمنداڵییەوە ڕێگەی لە دونیا دابڕان‌و نیازی هەڵبژاردو هەرگیز دڵی بۆ هەواو هەوەسی دنیای پووچ, لێینەداوەو تالەژیاندا بووە, هەرگیز دامێنی پاکی بەگەردووتۆزی هاودەمی‌و تێکەڵاوی ئاڵودە نەکردووە, بەڵکو ئارەزووی دڵی هەمیشە بەپێی (کلّ میسّر لما خلق لە) لەگەڵ زانستخوازان ویارانی گۆشەگیری‌و خەڵوەتنشینیدا, وهۆکاری ڕۆحی هەردەم لەسەر ڕێگەی خۆشبەختی‌و ڕزگاری بووە, تائەوەی قورئانی پیرۆزو موحەریرو تەسریف‌و چەند پێشەکییەکی زانستی ڕێزمانی خوێندووە, دوای ئەوە بۆ هەتا هەتایە, لەهەموو شتێك دابڕاوەو ئەسپی خواستی بەرەو دەروێشی تاوداوە, لە بەغدادا نزیکەی (4)ساڵ لەتەکیەی حەزرەتی





غەوسدا(خوا لێی رازی بێت) بووەو بەدڵسۆزییەوە خزمەتی دەروێشانی شەیدای ئەو مەزارە پاکەی کردووە, لەوانە شێخ ئەحمەدی نامی لە شێخزادەکانی گوندی چنارە, کە بەڕێزیان(خودا رازداری بکات) سەبارەت بەژیاننامەی شێخ ئەحمەد دەفەرموێت:

ئەو سەردەمە من لەتەکیەی غەوس بووم, وهەمیشەو بەئومێدی ئەوەی دەستم لە چمکی یەکێك لە ئەولیای خوداوەند گیر ببێت, دەستی دوعاو نزام بەرزکردەوە, شێخ ئەحمەدیش لەوێ بوو, ولەبەر ئەوەی لە رەفتارو کرداریدا نیشانەی خۆشەویستی‌و عیشقم دەبینی, بۆیە شەیداو هۆگری بووم . بەڕێکەوت لەو ماوەیەدا کە هاوڕێی بووم‌و تۆوی ویستیم لەسنگمدا چاند, حالەتی شەیدایی بەجۆرێ لەودا زاڵ بوو, کە جارێ بەنیازی خوێندنی نوێژی مەغریب بوو, بە (اللە اکبر)ی تەحریم دەستی پێکرد,کەواتە ئەوپیاوە کەشەیدای خودا بو, (خرّ موسى صعقا)بێ هۆش‌و مات‌و مەلول وەستابوو, تانیوەشەو بەوشێوەیە مابۆوە, دوای ئەوە بەئاگا هاتبۆوە, بێئۆقرەگرتن بەسەربان‌و بن باندا رایدەکردو دەردەکەوت‌و گاه پێدەکەنی‌و گاه سۆزی دەکرد, من لەخۆشیاندا, وەکو سێبەر دوای دەکەوتم‌و هەر جارێ خۆی لەسەربانی ژوورەکانەوە دەخستە خوارەوە, دەمگوت رەنگ بێ هەموو ئەندامی گیانی شکابێت, بەڵام بەسەلامەتی هەڵدەستایەوە . وهەروەها فەرمووی:

یەکێکی تر هەبوو بەناوی نور عەلی شا, کە مانگێکی چواردوبوو, کەس گوێی لەدەنگی نەدەبوو خواردن‌و خەوتنی نەبوو, ئارامی لێهەڵگیرابوو, کاری ئەوەبوو, خەڵووزی بەدەستەوە دەگرت‌و لەسەر دیوارەکان دەینووسی ولەژێر لێوەوە شتی وەهای دەگوت کەس

تێنەدەگەیشت . لەگەڵ شێخ ئەحمەد, بەهێما قسەیان دەکردو, لەو جۆرە مامەڵەیەی نێوانیان منیان دەهێنایە پێکەنین.

فەرمووی: لەکاتی سۆزی شێخ ئەحمەد دا, رۆژێك نزیکی نوێژی هەینی بوو کە نور عەلی شا مەسینەیەك بەدەستەوە دەگرێت و ئاماژە بەشێخ ئەحمەد دەکات کە دەستنوێژ بگرێت, شێخ ئەحمەد مەسینەکەی لێوەردەگرێت و دەست نوێژی تەواوی گرت و بۆنوێژی هەینی چووین, دوای نوێژ شێخ ئەحمەد ئاماژەی کرد کەبڕۆم بەدوایدا و رۆیشتین تاگەیشتینە کۆتایی شاری بەغدا, گەرەکێکی وێران بوو دوکانێکی لێبوو, (1) حۆقە خورمای کڕی و خستیە کۆشمەوەو گەڕایەوە, ومنیش بەدوایدا رۆیشتم, تا گەیشتینە شوێنێکی چۆڵ, ئاماژەی کرد کەخورماکە دەربکەم, خستمە بەر دەمی, ناوکەکانی دەرهێناو خستییە کۆشمەوە, تاگەیشتینە مزگەوتێکی کۆن, نزیکی حەزرەتی غەوس(خوالێی رازی بێ), حوجرەیەکی لێبوو, چووەناو ژوورەکەوەو ئاماژەی کرد کەهەرشەوە, بەئەندازەی دوگوێز لەو خورمایەی لەگەڵ شەربەیەك ئاوی بۆ ببەم . بەپێی فرمانەکەی جولاّمەوە تا ئەوەی چلەی تەواو کرد, لەو ماوەیەدا شتی سەیرو سەرسوورهێنەرو داهێنانی زۆرم لێی بینی. جارێکیان لای ئاشناکانی خۆم, هەندێك لەو کەرامات و نیشانانەم خستە روو, هەرکە چوومەوە خزمەتی, گلەیی کردکە: کەس بەتۆی نەگوتبوو ئەو جۆرە باسانە بکەی بۆ کەس, شەرم دایگرتم . ودوای تەواو بوونی چلەی خەلوەتەکە, گەڕایەوە بۆ تەکیەکە . رۆژێکیان لەحوجرەدا خەوتبوو, منیش هەندێ دوور لێوەی دانیشتبووم, ئەوەهات بەدڵمدا کە: ئەگەر شێخ ئەحمەد منی خۆش بویستایەو بایەخی بەمن بدایە,





ئەڵبەتە خێری بەمن دەگەیشت, یەکسەرە سەری هەڵبڕی و گوتی: بەڵێ بەڵێ تۆم خۆش دەوێ وهەست بەوە دەکەم, بەلاّم دەبوا تۆ بۆ فلاّنە شوێن نەڕۆی . ومن لەو ماوەیەدا, کەسێکم خۆش دەویست و تۆوی خۆشەویستی ئەو کەسەم لەدڵمدا چاندبوو, ولەرۆیشتن بۆ ماڵەکەی, ئەو رۆژە ناچار بووم و ئۆقرە گرتن لە بینینی ئەو شوێنە, وەکو ئەم دێرە شیعرە وابوو:

وما حب الديار شغفن قلبي        ولكن حبّ من سكن الديار

وامزانی شێخ ئەحمەد لەخەودایە, رۆیشتم و لەدوورەوە چاوم گێڕا بەماڵەکەداو گەڕامەوە, کەگەڕامەوە خێسەیەکی لێکردم و وتی هەی حەیوان .. خۆت نەگرت و هەوەسی ئاڵفت کرد, بەتەواوی شەرم دایگرتم و لەو خۆشەویستییە دوورکەوتمەوە, نزیکەی یەك ساڵ بەو جۆرە خزمەتی ئەو پیاو چاکەم کرد . لەخزمەتکردنیدا, گەنجینەی خۆشبەختیم بەدەست هێنا, تاوەکو ئەو زاتە رووی لە حیجاز کردو منیش لەبەغدادا مامەوەو نامەی دووری ئەوم بەسۆزو شەوقەوە دەخوێندەوە.

هەروەها بەرێزیان گوتی کە: شەیدایەکی تر هەبوو کە ئاسەواری شەیدایی تێدا ئاشکرا بوو, جارێکیان بڕیارم دا کەهەر بەو پیاوە بگەم, بڕی سێ درهەم کەلەگیرفانمدا بوو, بیدەم بەو, بەرێکەوت نزیکی مەزاری غەوسی گەورە بەو گەیشتم, لەپڕ ئەوە بەدڵمدا هات کەبۆچی ئەو سێ درهەمەی بدەمێ, بەڵکو هەندێ پارەی وردەی تری بدەمێ, دەستم بەگیرفانمدا کرد, هەندێ وردەم دەرهێنا تابیدەمێ, دەستی هێنا بۆ دەستم, گوتی ئەی بۆچی سێ درهەمەکەم نادەیتێ, شەرم گرتمی و سێ درهەمەکەی کەپێشتر نەزرم کردبوو, پێشکەشم کرد .

هرکس رابهر کاری ساختند        میل آنرا دردلش انداختند

لەبەر ئەوەی خاکی بوونی ئەو پیاو چاکە بەپێی: (ان الله خلق الخلق في ظلمة ثم رشّى عليهم من نوره فمن أصابه من ذلك النور فقد اهتدی) بەئاوی ڕێنموونکردن گیرابۆوە ولە زەمینی تواناییدا تۆوی خۆشبەختی چێنرابوو, بەناچارییەوە بەپێی: (الحكمة ضالّة المؤمن) لەبەدواداچوونی گومرایی خۆی سەرگەردان و دوورە پەرێز لەتێکەڵبوون لەگەڵ بێگانەو خوێشی, لەهەر کەسێك داوای بریسکەی دەکردو لەهەر هزرمەندێك داوای گەوهەری دەکرد, تاوەکو بەپێی (من طلب وجدّ وجد) دەرمانی دەردی خۆی پەیدا کردووەو دەستی بەچمکی کەوای سەرکاروانی ڕێنموونیکردن گەیشتووەو ئەسپ ئاسا بەرەو مەبەستی خۆی چوار ناڵە دەکات . لەزمانی پڕ گەوهەری خودی شێخ بیستومە کەفەرموویانە:

ئەو کاتەی لەتەکیەی حەزرەتی غەوس(خودا لێی رازی بێت), سەرقاڵی دەستەبەرکردنی زانست بووم بە دەم دەردەوە دەمناڵاندو دیدەی ئومێدم بەرووی مژدەی دەستەبەرکردندا دادڕپیبوو, کەکەی خورمای ئارەزووم بەر دەگرێت و خۆری ڕێنموونکردنم لە هەڵهاتنی تەوێڵی خۆشبەختیی کام دەوڵەتمەندێکدا, سەر هەڵدەدات, ڕۆژان لەو بیرەدا بووم و شەوانیش لە خەفەتدا خەوبە چاومدا نەدەهات, تائەوەی کە:

شبی خوش همچو صبح زندگانی        نشـاط افزا چـو ایام جوانی





بەو خەیاڵەوە سەرم نایە سەر سەرینی غەمگینی و دیدەی هەستم نوقاندو چاوی دڵم بە رووی جیهانی کاتیدا کردەوە, بەو نییەتەی کەبەڵکو لەلایەن مەبەستەوە هێمایەك و بەپەسەند کردن و دەستەبەرکردنی خواست, مژدەیەکم پێبگات. لەپڕ لەسروشەوە دەنگێك گەیشتە گوێی هۆشم و سەرتاپای بەدەنم چێژی لێوەرگرت, بەو مانایەی کەسەردەم سەردەمی خالید پاشا بێت, دۆستان و یارانی شادو خۆشحاڵن, بەرێکەوت لەو کاتانەدا, عەبدورەحمان پاشاو خالیدپاشا , لەسەر حوکمڕانیی سلێمانی ناکۆك بوون, من لەشکۆی ئەم سروشە بەخەبەر هاتمەوە, ناتوانی و دڵتەنگی زۆریان بۆ هێنابووم و گەیشتمە ئاستی ناکامی . گوتم: سەیری بەدبەختی بکە, من داوای چی دەکەم و بۆ چ شتێك ئاماژە دەکەن, من خۆم لە فرتو فێڵی کۆتی دونیا دەدزمەوەو نێچیر ئاسا دەکەومە داوی شکارچییەوە . چەند ڕۆژێك بە دڵتەنگییەوە لەو حاڵەتەدا بووم, ولەگەڵ بەختی خۆمدا مشتومڕم بوو, لەپڕ بەپێی(ان مع العسر يسرا) بەختم هەڵهات ودەروازەی خۆشبەختی بەشنەی ڕێنموونکردن, بەرووومدا کرایەوە, واتە حەزرەتی سەرچاوەی زانست و ڕێنموونکردن و خۆری ڕێنموونکردن چرای حەق و ئایین و تەختی ویلایەت شێخ خالید(خودا رازداری بکات) لەگەشتی جیهان ئاباد بەنییەتی ئەوی جیهان بەڕووناکی ئاوەدان بکاتەوە, سەردانی بەغدای کردو بووبەمیوانی تەکیەی حەزرەتی غەوس (خودا لێی رازی بێت) ورەنگو بۆیەکی نوێی بەدەرودیواری ئەو شوێنەپیرۆزە بەخشی .

ئەوسا بۆم دەرکەوت کەئەو خالید پاشایەی لەرووداوەکەدا, ئاماژەیان بۆ من کردبوو, ئەم شایەی دەڤەری حەقیقەتە, نەك پاشای مەجازی:

شاه آن دان کو زشاهی فارغ است　　بی‌مەو خورشید نورش بارتغ است
امـــــر اوبرملك دل باشد روان　　اوچوماه واهل دل چون شب روان
دل بدست او چـــو موم نرم دان　　مهر او گـــــــه ننگ سازد گاه نـام
پـــــــادشاهان مجازی بندەاش　　حلّـــــــه پوش از ژندۀ فرخندەاش

فەرموویان: هەرکە بەخزمەتی گەیشتم, منی ناسی و گەلێ نەرمونیان بوو لەگەڵمدا, چونکە ئەو سەردەمانەی لەسەردەمی لاویدا, ئەو قوتبە گەورەیە, بەمەبەستی خوێندن تەشریفی بۆ گوندی تیوڵە هێنا, بەخزمەتی گەیشتمو نەخشەی دڵسۆزیو ویستی لەسەر لاپەڕەی دڵم کێشابوو, هەرکەخوازیاری پەسەند کردنم لەحەزرەتی کرد, تا لەسەر دەستی تەریقەت وەربگرم, لەرووی میهرەبانییەوە پەسەندی کرد بەداواکردنی کاری خێر, هەروەکو لەنێو تەریقەتدا هەیە, فرمانیان کرد, لەرووداوێکدا کە مەلێکی رووبەڕام:



گشت آزاد ازغم وبند جهان　　درفضای سادەو صحرای جان

وامەزندە کرا لەگەڵ تاقمێکی گەورەدا, بەرەو لوتکەی چیایەك, شکۆمەندانە سەردەکەوین, هەروەکو بڵێی بەدوای شتێکدا یان لەخۆشی گەیشتن بەخۆشەویستێك, بەهەولۆ تەقللای تەواوەوە

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

هەنگاو دەنێین . من بە یارمەتیهێزی خوداوەندی, توانیم پلە بەپلە سەربکەوم, تاوەکو گەیشتمە سەر لوتکەی چیاکەو پەرچەمی بەرزیو شکۆمەندیم شەکاندەوە . بینیم کە شابازی بەرزەفڕی شکۆمەندی هەردوو جیهانو ئەو شای ئاسمانی خۆشبەختی هەمیشەییو ئەو تاکە سوارەی مەیدانی گەشتی خوداوەندی, ئەوکەسەی کەهەموو پلەکانی نزیکی ورەزامەندیی حەزرەتی حەقی, بەتواناوە دەستەبەر کردووە, چرای حەقو ئایین, شێخو پیرو دانای ئێمە, مەولانا خالید(خودا رازداری بکات) لەسەر لوتکەی ئەو چیایە بەئەوپەڕی شکۆمەندییەوە, تاقمێك لەمەحرەمانی راز لەخزمەتیدا بوونو لەبادەی پیرۆزی, پێکی دڵیان دەنۆشی, کەنزیك بوومەوەو بەخزمەتی موبارەکی گەیشتم, فەرمووی: دانیشە تاوەکو وانەیەك لەم کتێبەت فێر بکەمو چرایەکی زانست لە تاریکستانی دڵتدا, هەڵبکەم . لەخزمەتیدا دەست لەسەر ئەژنۆ, دانیشتمو گوێم بۆ حەقیقەتو زانستەکانی شل کرد, ئەو وانەیەی لەو کتێبەدا بەمنی گوتو گەوهەری رازی بەئەڵماسی بەیانو راگەیاندن تیژ کرد, ناوەڕۆکی ئەو کتێبە نەفارسیو نەتورکیو نەعەرەبی بوو, وامزانی کە ئەو کتێبە زانستی سەیرو سەمەرەی مەغریبی بوو, رۆژی دوایی کەبەخزمەتی گەیشتمو رووداوەکەم بۆ گێڕایەوە, تەوێڵی موبارەکی کرایەوەو گەشایەوە, مەسەلەکەی بۆ ئامادەبوان باسکرد, وخونچەی دەمی بەشنەی زەردەخەنە کردەوەو فەرمووی: ماشەڵڵاعوسمان لەرووداوی سەرەتاو بنەتادا, کاری خۆی بینیوەو, رێگەی رەفتاری پلەو پایەکانی کەماڵی بەگشتی لە جیهانی میسال, بەروویدا ئاوەڵابووە .

کەواتە هەر هەمان کات فێری زیکری تەریقەتی بەرزی کردووەو کلاوڕۆژنەی بەهێزو توانای ئەو ئاراستەکردنەی لە تاریکستانی دڵمدا هەڵکرد, کە مۆمێکی لەدڵمدا ڕۆشن کرد بەجۆری کەدڵۆپ لێی دەچکا. لەسەر داوای بەڕێزیان, لەسەر زیکری ئەو تەریقەتە بەردەوام بووم, ودیدەی دڵم بەبینینیو ویستو ئاشکرابوونەکانم دەکرایەوە کەلەم تەریقەتەدا, لە ڕێگەی (اندراج النهاية في البداية)دەردەکەون, تاوردە وردە ڕووناکی کەلەکاتی پاکژبوونو ڕوونبوونەوە, بەرەنگی جۆراو جۆر دەردەکەون, دەرکەوتن . وهەریەکە بەزیکری ناوی خودا کەوتنە دوان .

ئەوسا سوڵتانی زیکر هەموو بوونی منی داگرت, بەرادەیەك کە ئاهەنگو ئاوازی زیکرەکەم لەگۆشتو پێستو مووی خۆم, بەگوێی هۆشم دەبیست, وچێژی کەلەسەرووی هەموو چێژەکانەوەیە بەدڵ دەمچێشت, وبۆنو بەرامەیم کەلەبۆنی میسكو عەنبەر خۆشتر بوو, بەمێشکی ڕۆح بۆنم دەکرد, وهەروەها هەموو جیهان کەوتە زیکرەوەو بەپێی (وان من شيءٍ الاّ يسبّح بحمده) گەیشتە ئاستی ڕوونی.

فەرمووی: گڕی شەوقو خولیای بەرادەیەك بەسەرمدا زاڵ بوو, کەیەکسەرە لەڕووداوەکەدا بینیم کەبووم بە ئەژدیهایەکی گەورە کە هەموو جیهانم هەڵدەلووشیو کەدەشم هەرداوای زیاتری دەکرد . چەند ڕۆژێك کەرەتبوو, گوزارشتیان لەو حاڵەتەی جیهانی میسالو نموونە دەکرد, بەرواڵەتیش دەرکەوت . وئەو ماوەیەی لە سلێمانی بەخزمەتی گەیشتم, دەردو ئەندێشەی برسێتیم بە ڕادەیەك کێشا کەهەرچیم دەخوارد, تێرنەدەبووم . ڕۆژێکیان ژمارەم کرد (32)نانو چەند بەلەم پلاوو چەند قاپ گۆشتو شتی ترم خوارد, هێشتا گەدەم





دەینالاند, تاوەکو یەکێك لەموریدەکانی حەزرەت (خودا ڕازداری بکات)کەدەستی شکابوو, هەندێ هەویرو خوێیان لەسەری دانابوو وهەویرەکەیان لەسەر تاقێك دانابوو, ئەویشم خواردو سوودی نەبوو, ئیتر خەڵکەکە لای حەزرەتی مەولانا شکاتیان کرد کە هەرچی دەخۆم تێر نابم . بەزەردەخەنەوە فەرموبووی کەئەگەر دووکەسی وەکو عوسمانمان هەبایە, خۆراك لەم شارەدا نەدەما . ئەوسا بەدەستی خۆی دوونانی بۆرەوانە کردم و ڕێگەی پێدام کەبەرەو ماڵی باوکی بڕۆم, منیش دوونانەکەم وەرگرتو لەدەرەوەی شاردا خواردمو چاکبوومەوە .

جارێکیان لەرێگەی نێوان بەغداو سلێمانیدا بووین, حاڵەتێکم بۆ پێشهات, هەر کە بەخزمەتی ئەو حەرزرەتە گەیشتم, ڕووی لەقیبلە کردو فەرمووی: خودایا, میهرەبانیو چاودێری کەوەکو خۆر لە ڕۆژهەلاتی ئەربابی مەعریفەدا, سەرهەڵدەدات, جگە لە مەزنیی تۆ, هیچ شتێك ناتوانێت بەردەمی بگرێت. بەلام ویستی هەمیشەگیی حەزرەتت وادەخوازێت نامۆییو دووریو ئەندێشەو بەلاو نارەحەتیی بیابانو ئاوەدانی بچێژێتو دەستی بەو دەسەلاتە نەگات . وکەسێکی تر کەلەشوێنی خۆیدا, بێکارو بێئومێدو دەست لەئەژنۆ دانیشتووە, دەیگەیەنێتە ئەو پلەو پایە بەرزە :

از سبب سوزيش من سودائيم وز سبب سازيش سوفسطائيم

وفەرموویان: لەسەرەتادا, پەیوەندیی هێندە بەسەرمدا زاڵبوو کەلەهەر تۆزقاڵێك لەم جیهانە, وێنەی موبارەکی شێخەکەی خۆمم

دەبینی, وبەهەموو ئەو حاڵەتەوە, بەزمانی حاڵو دڵ گفتوگۆم لەگەڵدا دەکردو بەگوێی هۆشم وەڵامم دەشنەفت, جارێکیان بۆ تاقیکردنەوە, حەزرەت لێی پرسیم کە بۆ نموونە, لە بواری حەڵاڵبوون و حەرامبوونی نێرگەلە پرسیار بکەم, چ وەڵامێك دەدرێتەوە ؟ بەپێی فرمانەکەی پرسیارم کرد لە کۆڕەکەدا . وەڵامی دایەوە کەنێرگەلە نەحەڵاڵەو نەحەرامە, بەڵکە کارێکە رێگەی پێدراوە, فەرموویان: بەڵێ راستە . گوتم کەواتە شێوازی نموونەی من, وەکو شێوازی نموونەی حەزرەت وابوو وجیاوازیی نێوان هەردوو شێوازەکەم نەدەبینی . فەرموویان, ئەم پێگەیە کۆبەندی پەیوەندییە. گوتم: دوای ئەوە جیاوازیی دووشێوازەکەش یەکالا بووەوە یەك شێوازم دەبینی . فەرموویان: ئەمە پێگەی کۆبەندیی کۆیەو توانەوە لەشێخدا بریتییە لەم حاڵەتە, کەواتە مامەڵە لەتوانەوە لە شێخدا, بەتوانەوە لەپێغەمبەردا دەگات کەگەشتەکەمان لەهەموو بوونەوەران و کۆوکۆی کۆدا, لەشێوازی میسال و نموونەی ئەو حەزرەتەدا, دەستەبەر بوو.

فەرموویان: سەردەمانێك وەها دەمبینی کەسەرانسەری جیهان هەر لەعەرشەوە تاسەرزەمین, تەنانەت مەلایکەو پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت) کرنووش بۆ حەزرەتی مەولانا (خودا رازداری بکات)دەبەن, وبەو پەڕی بێتوانایی و نیازەوە, روو لەو میحرابی خۆشبەختییە دەکەن . گوتم لەم رووداوە بەتەواوی مات و وڕ بووم و پیتی سەرگەردانیم لە تابلۆی خەیاڵدا خوێندەوە . فەرموویان: فلانی ئاگادار بە, کافر نەبی وخەرمانی بڕواو ئیسلامی خۆت نەدەیتە بەربای بێ بڕوایی و خودا نەناسی .گەلێ لەموریدان بەهۆی ئەو حاڵەتەوە کە تۆیشی تێدایت, بڕوایان لە دەست داوەو رێبەری خۆیانیان لەبری





خوداپەرستووەو ئەم دونیاو ئەو دونیایان لەدەست داوە . ئەوەش بزانە ئەم کرنووشەی سەرانسەری جیهان بۆ من نییە, بەڵکو بۆ محەمەدە (درودی خودای لەسەر بێت) کەلەمندا سەریهەڵداوەو بوونی نابووتی منی, بەدەرکەوتنی خۆی خۆشبەخت کردوە . ئیتر ئارام بوومەوەو دەستم بەکاری خۆم کردو پوشاڵی بوونی خۆمم, لە ناو کورەی عیشق و سۆزدا سووتان .

دوای ماوەیەك ئەو حاڵەتە لە خۆیشمدا سەریهەڵدا کەسەرانسەری جیهان روویان لەمن کردو بەوپەڕی لەخۆبوونەوەو خۆشکاندنەوە, کرنۆشیان بۆ من دەبرد . لەوکاتەوە دەرکەوت کە کەسگەلێك هەندێ لەوەلییەکانی وەکو سوڵتان ئیسحاقیان[1] وەکو خودا پەرستووەو سەرچاوەی گومڕاهیان لەوێوە بووە . دوای ئەوکارە لەزیکرو رابیتەوە, گەیشتە خواستی راستەقینە . بوونی یەکتایی لە ئاوێنەی فرەگەرییدا

(1)سوڵتان ئیسحاق کوڕی عارفی ناودار سەید عیسای بەرزنجییە, باپیری ژمارەیەکی زۆر لەساداتی کوردستانی ئێران و عێراقە, سوڵتانیش یەکێك بوو لەگەورە عارفان و شێخانی کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەم .

سەید عیسا فەرزەندی سەید بابا عەلی هەمەدانی لەساڵی 656 کۆچی, لەهەمەدانەوە کۆچی کردووە بۆ سنە تاقمی ئەهلی حەق کەبەعەلیوڵڵا ناسراون, سوڵتان ئیسحاق بەپیرو رێبەری خۆیان دەزانن وزیارەتی مەزاری سوڵتان, کەدەکەوێتە گوندی شێخانی هەورامانی لهۆن, لەسەر رووباری سیروان, بەحەج هەژمار دەکەن (نووسەر) .

بەدەر لەتەڵخیی بارستایی، بەبێ چۆنایەتی وچەندایەتی دەبینی، واتە سەربەندی زۆرینەو فرەگەریی بەتەواوی هەڵماڵرا:

یکی ماند آن هم ازنعت یکی پاك    زبسیاری فزون وز اندکی پاك

تائەوەی فەنای راکێشان کە تایبەتی ڕێگەی (اندراج النهایة في البدایة)یەو لەتەریقەتی پیاوچاکاندا بەوجودی عەدەم ناودەبرێت، ڕوودەدات:

وصل اعدام اگر توانی کرد    کارمردان حق توانی کرد

لەو کاتەدا، مامەڵە لە ڕاکێشانەوە بۆ ڕەفتار دەچێت، هەر پێنج مەلی میهرەبانی لەقەفەسی سینگدا باڵدەگرن و ڕوولە بارەگای خۆیان دەکەن . ودەکەونە سەر ڕێگەی ئاسۆکان و باڵیان بەرەو جیهانی نەفس دەکەنەوە .

فەرموویان: جارێکی تر لەمیانەی ئەو گەشتە ئاسۆییەی کەعبەی پیرۆزدا، لە نوێژۆلەکاتی تردا دەمبینی، نەفسم لەم مامەڵەیە تووشی بوغرایی دەبوو، هەرکەبەخزمەتی حەزرەت گەیشتم، فەرموویان کەلەتۆدا بوغرایی و شادی دەچنمەوە، فەرموویان ئەم جۆرە باسوخواس و نمایشانە، لەم تەریقەتەی پیاوچاکاندا گەلێجار ڕوودەدات، بەڵام ئاگاداربە تووشی بوغرایی نەبیت کەبەپێی تێبینی، مەبەستی سەرەکی ئەندازەیەکی نییە، تاکەسێك بەو هۆیەوە دڵشاد ببێت. چەند ڕۆژێك ڕەت بوو، بینیم کە لەئاسمانی چوارەم، لەبەرامبەر کەعبەی پیرۆزو بەرامبەرەکەی، خانوویەك هەیەومەلایکە چواردەوریان داوەو تەواف دەکەن، هەمدیسان تووشی بوغرایی بووم،





هەرکەبەحەزرەت گەیشتم، بەسامەوە سەیری کردم کەسەرتاپێ سوورهەڵگەڕام، فەرمووی دووبارە ئەمە چ حاڵەتێکە کە بوغرا بوویت و دەنگی پرتەو بۆڵەت هێناوەتە گۆڕەپانی بەختی خۆتەوە، فەرمووی چۆن چۆنی، گوتم لەبەرامبەر ماڵی خودا، وەکو دووبەردی دەسار کەلەسەر یەکتر بن، دەردەکەون . فەرمووی بەوشتانە فریو نەدرێیت کەمەبەستی ئێمە نین .

وفەرمووی: لەقۆناغی سلوکدا، کەسێکم دەبینی لەسەر تەختێك دانیشتبوو، خۆی بەخودا لەقەڵەم دەدا، هەرکەگەورەکەی خۆمم ئاگادارکردەوە، فەرمووی ئەوە شەیتانە لەوێدا، ڕێگە بەسالیك دەگرێت و ئاگاداری خۆت ببە کەفریوت نەدات، ئەگەر جارێکی تر پەیدابووەوە، پشتی لێبکەو بڵێ: ئەی نەفرەتکراو، بڕۆ کەخودای من کەسی لەڕەنگ نییەو تۆ سەرتاپێت ڕەنگە . گوتم: هەر کەبەفەرمانی جوڵامەوە، بینیم کە ئەو نەفرەت لێکراوە، لەتەختەکەی کەوتە خوارەوەو خۆی و تەختەکەی لەبەرچاوم ون بوون، دوای ئەوە ئەو نەفرەت لێکراوەم دەبینی لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاواو، لەرۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات رایدەکرد، وەکو کەسێك کەلەترسدا خۆی بشارێتەوەو وای دەردەخست کەلەترسی سۆزی دەروونی من ئارامی لێهەڵگیرابێت و لەوە دەترسا کەئاگرم تێبەربێت.

فەرموویان کە ئاگاداربە بەقسەی ئەو نەفرەت لێکراوە هەڵنەخەڵەتێی، مەبەستی ئەوەیە گوێڕایەڵی قسەکانی بیت و لەبەدی ئەو نەترسیت تابە زەویتدا بماڵێت و بەمەرامی خۆی بگات، دوای مشتومڕێکی زۆر، لەئاکامدا لەگەشتی ئاسۆکان ڕزگارم بوو وپێم نایە جیهانی نەفسەکانەوەو بەواتەی (وفي انفسكم ولا تبصرون) دیدەی دڵم

بەئاشکرابووەکان و هاتووەکان شاد بوو . میهرو لوتفی هەریەکە بەرەچەڵەکی خۆیان گەیشتن کەلەسەرعەرشەو رەهابوون لەدووری و زیندانی جودایی و ئاسۆکانیان بڕی و بەتەختی مەلەکی نەفس گەیشتن, لەم دەستوبەندەدا, بەندە کەحامیدم, لەبەرێزیان پرسیارم کرد کە لەنووسینەکانی حەزرەتی موجەدید(خودای لێ ڕازی بێت)دا تۆمار کراوەکە: هەندێ لەوەلییەکان, بەشێوەی زنجیرەیی, سلوك ئەنجام دەدەن کەلەدڵەوە بۆ رۆح و لەرۆحەوە بۆ سەرو لەسەرەوە بۆ نادیارو لەنادیارەوە بۆ نادیاریی دەڕۆن و هەروەها لە ئوسوڵدا وئوسوڵی ئوسوڵیشدا ئەم پۆلێنبەندییە لە سلوکیاندا رەچاو دەکرێت . وهەندێکی دیکە گەشتیان تایبەتە بەیەك یادوو یاسێ یاچوار لەتیفە, بەپێی لێهاتوویی . گوایە لەهەر یەکێك لەم پلانەدا, کنەی کردووەو ئەو گەیشتووە(واصل)ی لەکنە کردنەوە گەیانۆتە خواستەیەك کەشهودی حەققە . بۆ نموونە بۆ کەسێك کەلێهاتوویی تەنیا لەگەشتی لەتیفەی دڵدایە, بۆ نموونە لە پێگەی دڵدا, کنەی کردووەو بەو ئاکارانەی هەڵچوون دەگات کە ئەسڵی ئەسڵەو هەروەها لە پێگەی رۆحدا کنەی کردووەو بەئاکاری سەلماندن گەیشتووەو ... هتد, ئایا گەشتی ئێوە لەوجۆرە بۆنانە لەکامیاندایە ؟

لەراپۆرتی حەزرەتیان واتێگەیشتم کە ویلایەتیان لەگەڵ سلوکی لەتیفەی دڵدا گونجاوترە, چونکە فەرمووی کەمامەڵەی من گەلێجار لەگەڵ دڵدا بووەو لەتیفەکانی تر بەپەیڕەوی لەدڵ, بەفەناو بەقا گەیشتوون, لەراستیدا ئەم زۆری کشوفاتانەو کەرامەتانەی ئەو حەزرەتە لەسەرەتاوە تائێستا دەرکەوتن و دەردەکەون, نیشانەی ئەوەیە کە خاوەنی پایەی ولایەتی دڵن . وچەندین جار لەو حەزرەتەم بیستووە کەدەیفەرموو, من سەرەتا خوداوەندی خۆم بە (العلیم)دیاری کردووەو لەحەزرەتی مەولانا (رۆحم بەقوربانی بێت)وابیستراوەکە (العلیم) خودای کەسێکە کە شەیدای محەمەد بێت, وهەروەها فەرموویەتی: ئەگەرچی خودای من (العلیم)ە, بەڵام لە هەموناوەکانیدا گەشتم کردووە, وخودا زانایە . فەرموویان لەو کاتانەدا کەگەشتی من لە جیهانی نەفسەکاندا بوو, جارێکیان لە رووداوێکدا بینیم کەگوایا بووم بە بازێکی شکار کەحەزرەتی مەولانا منی بەدەستەوە گرتووەو خەریکی شکارکردن بووم و هەر باڵندەیەکم لە ئاسماندا ببینیایە, هەر بەسەیرکردنی لە دوورەوە لە ئاسمان دەکەوتە خوارەوە بەڵام هەندێ لە باڵندەکان گەورەبوون, بەسەیرکردنێك نەدەکەوتنە خوارەوە . بۆیە حەزرەت داوای لێدەکردم شکاریان بکەم, بۆیە هەڵیدەفڕانم, هەر لەو دوور دەکەوتمەوە دەمگرتن و لەبەر پێی حەزرەتدا دامدەنان و رووداوەکەم لە خزمەتیاندا دەگێڕایەوە . سەبارەت بەوە هیچی دەرنەدەبڕی, بەلام لەو رۆژانەدا, شەرەفی ئەوەی پێ بەخشیم و مۆڵەتی‌دا کەکاری ئیرشاد بکەم و دەروازەی میهرەبانی بە روومدا کردەوەو لەوکاتەدا راستیی رووداوەکە کە لەجیهانی میسال(نموونە)دا بینیبووم, لەجیهانی شهودیشدا دەرکەوت .

لەبەر ئەوەی حەزرەتی مەولانا(خودا رازداری بکات)مۆڵەتی رەهای بەمن بەخشیبوو وفرمانی بەهەمو جێنشین و موریدانی دابوو, لەئەڵقەو کۆڕی مندا ئامادەبن, هەندێ لە جێنشینەکان کە خۆیان بەکامڵ دەزانی و منیان بەناکامڵ هەژمار دەکرد, لەبۆچوونی خۆیاندا, بڕوایان بەمن نەبوو, بەڵکو رەچاوی فرمانی حەزرەتیان دەکردو بەزۆرو نابەدڵ

لەکۆڕەکانی خەتمدا دادەنیشتن, بۆیە لەتوانایی من, هەندێ درەنگ حاڵی دەبوون, ومنیش غیرەتم ڕێگەی نەدەدام کەسوود وەرنەگرن , بۆیە کەهەڵوێستەدەکراو ماوەی کۆڕەکان درێژەی دەکێشا , هەندێ لەوانە, لەخزمەتی حەزرەتدا گلەییان کردبوو کە: فلانی درەنگ لە ئاراستەکردنی لەکۆڕ دەبێتەوەو خەڵکەکە بەهۆی سستی منەوە, بێزار دەبن . حەزرەت لەوەلامدا فەرموویان کە: چاوێلکەی من لە کولەکە نییە, لە سستی عوسمانو هەڵوەستەکردنی, حیکمەتێك هەیە بەلام ئێوە دەرك بەوە ناکەن . بڕۆن بانگی بکەن . هەر کە گەیشتمە لای حەزرەت بەنەرمونیانی رووی تێکردمو فەرمووی:دەڵێن لەئاراستەکردندا, درەنگ لێدەبێتەوەو گوایە خەڵکەکە بەم بۆنەوە تووشی بێزاری بوون, بۆچی وادەکەیت ؟ منیش گوتم: قوربانت بم, راستیت پێبڵێم ؟ فەرموویان: بەڵێ . راستیەکەم پێ‌ڕاگەیاند کە هەندێ لەو کەسانەی ئامادەی کۆڕەکە دەبن بڕوای تەواویان بەوتەکانی حەزرەتتان هەیەو بەبڕوای تەواوەوە لە کۆڕو حەڵقەکاندا دادەنیشنو داوای زانستی زیاتر دەکەن, هەر کەلێیان نزیك دەکەومەوە, بەهرەی خۆیان وەردەگرن. بەلام هەندێکیان بەبێ توانا دەزاننو تەنیا بەهۆی فرمانی بەڕێزتانەوەیە لەکۆڕەکانماندا ئامادە دەبن, بۆیە دەروازەی زانست بەروویاندا داخراوەو غیرەتی منیش ڕێگەم پێنادات کەبێ‌بەهرە لە کۆڕەکە هەستنە سەرپێ‌و بەناچارییەوە مەسەلەکەیان بۆ دەکەمەوە, بۆیە کۆڕەکان درێژە دەکێشن, هەر کەئەمەم راگەیاند رووی تێکردنو فەرمووی: نەمگوت چاویلکەی من لەکولەکە نییە ؟ راستی رووداوەکە ئەوەبوو کەعوسمان گێڕایەوە .ئەوتاقمە لەشەرمدا سەریان داگرتو توانای قسەکردنیان نەما.

مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی

کەواتە راڤەکردنی ئەو رووداوە کەزیاتر لەجیهانی میسال بینی بووم, بەرواڵەتیش ئاشکرابوو, زانیم کە ئەوباڵندەگەورانەی بەیەك سەیرکردن شکار نەدەکران, ئەو جێنشینانەبوون کە بڕوایان بەتێبینی کردنی گەورەیی خۆیان و بچووکی من نەبوو و, لەسینگیاندا تۆوی دڵپیسی و غیرەیان بەرامبەر بەمن دەچاند .واتە خۆشەویستی حەزرەتی مەولانا (خودا رازداری بکات) سەبارەت بەحەرزەتی شێخمان (خودا بیپارێزێت)رۆژ بەرۆژ لەزیادبووندا بوو, ئەختەری خۆشبەختی و سەروەری لەتەوێڵی رووناکی ئەودا دەرکەوتو جیهانی رووناك کردۆتەوەو لەنێوان یارانو هاوەلانی خۆیدا, دەرکەوتووەو کۆڕەکانی بەڕێوەبردووەو بەشەووبەرۆژ ئاراستەکردنی ئەنجام داوەو ئەوانە بەشێك بوونە لەسفرەو خوانی خێری پاشای تەختی عیرفان, بەرادەیەك کەپەروەردەکردنی ئەهلی سلوكو هیمەتکردن لەراماڵینی نەخۆشی و بەلای نەخۆش بەو بەخشراوە, تائەو مانگی یەکشەوەیە, هەروەکو دەڵێن(نور القمر مستفاد من نور الشمس) سەعات بەسەعات زیاتر لەرووناکی ئەو خۆرە سوودمەند بووەو بووە بەمانگی چواردەو ئەو کۆڕنشینی پەسەندکردن, لەپلەکانی بەرزو نزمبوونەوە, وردە وردە گەشەی کردووە, لەپوختەبوونەوە بۆ پوختەکردن, لەتەلوینەوە بۆ تەکمینو لەسلوکەوە بۆ تەسلیك, لەسەر تەختی ئیرشاد بەجێنشینی شای دەڤەری ڕێنموونکردن دانیشتووە, ئەهلی ویستو ئیرادە, بەپێی فرمانی ئەو فەرمانڕەوای سەروەرییە, وەکو پەروانە بەدەوری مۆمی کۆڕی وەلییەکاندا دەخولایەوە . خوازیارانو ئەهلی نیاز, هەریەکە خولیای دڵسۆزیی بەخزمەتی دەگەیشتن . لەوانەی لەو کاتەدا بەفرمانی ئەوحەزرەتە لەحوجرەی پەروەردەکردندا, لەخزمەتی

جەنابی شێخ سراجودین(ڕۆحمان بەقوربانی بێت)و لەگۆی هیمەتی, شیری بەرەکەتیان مژیوە, تاگەیشتوونە بەئاستی کەماڵو پیاوی گەورە: سەروەری سەروەران سەید ئیسماعیلی داغستانیو پەسەندکراوی چاودێری پەروەردگار, مەلاعەبدولحەکیمی کاشفەری, وخوالێخۆشبووخواناسو خەباتگێر شێخ محەمەدی بەڵخیش بەفەرمانی ئەو حەزرەتە, لەژێر دەستی جەنابی شێخماندا بووە.

دەگێڕنەوە کەجەنابی شێخ(خوابیپارێزێت) بەجۆرێ سەرقاڵی ئیرشادو خزمەتی ئەهلی ڕێنمونکردن بوو, ڕۆژانە تاکاتی شێوان, سەرقاڵی کۆڕی گشتی دەبوون, دواتر ڕووی لەحوجرەی خۆی دەکردو لەکۆڕی تایبەتیدا دەستەدەستە زانایانو گەورەپیاوان, بەرەکەتیان لێوەردەگرتو شەوانیش بەرێزی تەواوەوە لەگەڵ جێنشینانی گەورەی ئەو حەزرەتەدا, قسەی دەکردو تۆوی خۆشەویستی لەزەمینی هۆگریی پاکو خاوێندا دەچاند:

| | |
|---|---|
| روزو شب کارش این و پیشه چنین | لاجرم گشت شیربیشهٔ دین |
| اختری بـــــود برسمای شرف | گشت خورشید اوج علیّین |
| ازمقامات یك بـــــه یك بگذشت | تابسر حدّ ملك حقّ الـیقین |

وبەپێی فەرمایشتی خودی شێخو گەوایی کەسانی بڕوا پێکراو, تائەوسەردەمەی حەزرەتی مەولانا لەسلێمانی بووە, کاروباری ئیرشادی بەشێخ سراجودین دەسپاردو لەکاروباری زەروریو کەشفیەدا, پەنای پێدەبردەوەو کاری بەفەرموودەکانی دەکرد .





فەرموویان, لەبەر ئەوەی کاری ناحەزان لەسلێمانی گەیشتبووە ئەوەی کەرۆژی هەینی کەبۆ نوێژدەچن, دەرگای مزگەوتم لێبگرنو بەگژمدا بچن . شەوی ئەو رۆژە حەزرەت بەحوکمی(وشاورهم في الامر) لەگەڵ یاراندا راوێژی کرد, راو بۆچوونی زۆربەی جێنشینان ئەمەبوو: ئەگەر ناحەزان شەڕیان کرد ئەوا بەرگریی دەکەین کەبەرگریی کردن پێویستە, ومنیش سەری شەرمم داگرتبو و بێدەنگ بووم . لەم میانەدا ڕوویان لەمن کردو فەرموویان: فلانی تۆ چی دەڵێیت؟ گوتم: بەقوربانت بم, من لەو ئاستەدا نیم حیساب بۆ خۆم بکەن.

فەرمووی: تۆش هەرچی دەزانی بڵێ, گوتم: ئەوەی بەلای بەندەوە ئاشکرایە ئەوەیە کەبەڕێزتان ئەمشەو کۆچ بکەنو ئەم سوننەتەی پێغەمبەری سەروەر بەجێبهێننو تازەی بکەنەوە . هەرجارێ لەم نیودێرەدا هاتووە:

رای آنچه تو اندیشی, حکم آنچه تو فرمایی

حەزرەت ساتێمات بوو, دواتر فەرمووی: بەڵێ, ئەوەی تۆ گوتت راستە . ئامادەبووانی کۆڕەکە, کەوتنە تانەو تەشەر لەمنو حەزرەتیش بێدەنگییانی کردو لەهەمان کاتدا داوای لەمن کرد کەبەرەو ماڵەوە بڕۆم . بەپێی ئەم فرمانە لەسلێمانی دەرچووم . وحەزرەتیش لەگەڵ چەند کەسێك لەخۆبەخشەکانو کۆچکردووان بەرەوە خوداو پێغەمبەرەکەی, هەمان شەو بەرەو بەغدا بەرێکەوتنو دەرگای ئاخو داخی بەرووی بەجێماواندا کردەوە))( 1) .



[1]) بەپێی گەڕیدەی ناوداری ئینگلیزی (ریچ) کەخۆی لەو ماوەیەدا لە سلێمانی بووەو لەماڵی مەحمود پاشای بابانی فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیەدا

ئەمەبوو ئەوەی مەلاحامید, سەبارەت بەسەرەتای حاڵو ژیاننامەی شێخ سـراجودین عوسمـان(خـودا لێـی رازی بێـت)لـەکتێبی (ریـاض المشتاقین)دا, تۆماری کردووە .

ژیانی بەسەربردووە, ئاماژە بەکۆچی مەولانا خالید لەشاری سلێمانیدەکات گوایە لە (5)ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1820ی زایینیدا بووە . (نووسەر) .



## حاجی شێخ عەبدورحمانی نەقشبەندی موجەدیدی (ئەبولوەفا) یان(وەفا)

مەبەسـت لەنووسـینی ئـەم پێشـەکییە, راگەیانـدنی ژیاننامـەی ئـەم ئەوینـــدارو دڵـــداری زێبـــایی هەمیشـــەیی وشـــەیدای رێگـــەی حەقە(خوداوەند خۆیو نەوەکانی رازدار بکات) . لەراستیدا زمانی من لەوەسـفکردنی ئـەم گـەورە پیـاوە کەبەتەمـەنێکی کـەمتر لـە(30)سـاڵ گەیشتە پلەو پایەی بەرزی گەورەپیاوانی تەریقەت, ناتوانایە . باشتر وایە لەزاری خۆیەوە , پوختەی ژیاننامەی دەروونیی خۆی ببیستین:

بردە چشم نیم مستت آنچنان از جـــامرا　　　میتراود همچو مینامی زهر اعضا مـــــرا
همچو ماهی گرچە در بحر سکوتم غرق لیك　　　طوطی آسا نام جانان میکند گویا مـــــرا
دربیابان جنون باهرخسم خوش الفتی است　　　زانکە بوئی بردماغ آید از این صحرا مـــرا
باغبان بهرخدا روزی دو با من صبر کن
چون وفـا باشد بەهر گل الفتی تنها مرا

هەروەها دەڵێت:

بیروی توای دەست کجا صبر توان کرد　　　وین آتش عشقت بە تە سینە پنهان کـرد
مشتاق وصال توبمرگش نـرسد دست　　　ورنە زفراقت نتوان صبر بجان کـــــــرد
گرچشم توخون دل من خـــوردچە باشد　　　ترکیست کەاندر بچگی خوی بدان کـــرد
چون مفکر مهر منو حسن تو, تراویـد　　　شرمندە شداز گفت خودومهر دهان کـرد
گویند وفا توبە کن ازعشق وادب کن
من توبە کنم لیك عبـث دل نتوان کرد

# لەدایکبوون

لەبەرەبەیانی رۆژێکی بەهاری ساڵی 1253ی کۆچییدا, لەماڵی یەکێك لەگەورەپیاوانی تەریقەت, لەباوکێك کەتەمەنی (58)ساڵ بوو, منداڵێك هاتە دونیاوە, هێشتا ئاسمانی شارۆچکەکە بەهۆی ئەوەی لەناوجەرگەی چیای بەرزو گەردن کەشدا بوو, رووناك نەبووبووەوە, پەیرەوانی خاوەن دڵ لەخانەقاکەدا, بەچاوی راستەقینە, بینیان کەلەسەر حوجرەی یەکێك لەدانیشتوانی حەرەم, نوورو رووناکی دەبارێت و حەرەمو دەوروبەری رووناك کردۆتەوە . شنەی بەرەبەیان بۆنی گوڵو رەیحانی ئاوێتەبەبۆن و عەتری گەورەپیاوانی زنجیرەی بەرزی قادری(خودا رازداری بکات) دەگەیاندە ناخی رۆح, ئاوازی باڵندەکانی نزاکەر, پیاویانی بەرەو جیهانی راستەقینە پەلکێش دەکرد, بۆن و بەرامەی بەهەشت, دڵدارانی خانەقای هێنابووە جۆش و خرۆش . هاوارو ناڵەیان دەنگی دەدایەوە .

لەوکاتە گرانبەهایەدا, یەکێك لەجێنشینەدێرینەکان, بۆ خزمەتی شێخ سراجودین عوسمان رۆیشت و مژدەی داپێی کە: خوداوەند لەکچی حەزرەتی مەولانا خالید, کوڕێکی کەرەم کردووە, بەمەش شێخی ئاوێتەی شادمانی مەلەکوتی کرد, لەدواشەوی حەفتەدا, کۆمەڵێ لە رێزدارانی خەڵکی تیوڵە, هەژارانیان بۆخانەقا بانگێشت کردو, مەلاحامیدی کاتب کەیەکێك بوو لەگەورەپیاوان و هزرمەندانی هاوچەرخ, بەپێی فرمانی باوك, ناونابە عەبدورەحمان (ئەبو لوەفا) .





ولەبۆنەی مێژووی لەدایکبوونیدا کە بەخۆشی و شادی بەرێوە دەچوو, ئەم پارچە شیعرەی هۆنییەوە:

تعالی ان خداوندی کەتصویر جمال او — برون از حیطهٔ تحریر فکر است وخیال او
بودیك کاسه فردوس نعیم ازخوان احسانش — بودیك پایه عرش اعظم از تخت جلال او
بهار عیش خرّم اوّل ماه محرّم بود — کەاز نوغنچهٔ بشکفت ازباغ نوال او
گل گزار عثمانی نسیم باغ رحمانی — زهی آئینهٔحسن خداوندی جمال او
چونامش عبدرحمن گشت شداین نکته معلومم — کەهست ازعین رحمت شخص قدوسی مثال او
زسیمایش چو خور نور سعادت میشود لامع — تو برخیز وسعادت ختم کن یارب مآل او
بفکر اندر فرورفتم شنیدم هاتفی گفتا
((جمال باغ معنیها)) پی تاریخ سال او

هەروەکو ئاماژەم پێکرد, نووسەرانی نەقشبەندی کەمتر بایەخیان بەنووسینەوەی ژیانی زانستی و کۆمەڵایەتی و عیرفانی شێخ سراجودین و کوڕەکانی داوە, تەنیا ئاماژەیان بەکەرامەت و خەوارقی عاداتیان کردوون, مەلا حامید لەکتێبی (ریاض المشتاقین)دا, بەکورتی ئاماژە بە کوڕانی شێخ دەکات کەلێرەدا بەشێك لەو دێرانە دەهێنینەوە, دوای ئەوەی هەندێکیمان لابرد:

یکه تازان فضای خاندان نقشبند — شاهبازان هوای آشیان نقشبند
همچو دریا پر زجوش امّا خموش و ساکنند — ثابت وسیّاره اندر آسمان نقشبند
غنچەهای نو شکفته در گلستان صفا — بلبلان به گو در بوستان نقشبند

بەندە کەمەڵبەندی بازنەی ناتوانی وسستیم, نووسەری ئەم چەند دێرە, حامید لەساڵی 1251دا, بەخزمەتی شێخ و ئیمام حەزرەتی

سـﺴـراجودین گەیشـﺘـم, وچـاوم بـەوکیمیای بەختەوەرییـە کـەوت, منداڵێکی شیرەخۆرە یەکێك بوو لە کوڕەکانی, لەدەمی وەکو شەکری, بـۆنی شـیر دەهـات, ولەهـەمان سـاڵدا لـەدایك ببـوو ولـەجیهانی راستەقینەوە بۆ جیهانی مەجازی تەشریفی هێنابوو . بەندە لەهەمان ساڵدا, قەسیدەیەکم بەبۆنەی مێژووی لەدایکبوونیەوە, نووسیوە:

هـادی خلق شیخ عثمـان آن　　محرم بـــارگاه سبحانی
شاه گردن فراز عـالم قـدس　　شاهباز فضای روحـــانی
والـــه شوق آفتاب شـهود　　محـــو نور لقای یزدانی
ایزدش داد گوهری کـــەنزاد　　مـــادر دهر مرورا ثـانی
نـــــام اوشد تفألا معروف　　تـاشود شهره درخدادانـی
مه صفر بــودو روز نوزدهم　　کـەرسید از سروش ربّانی
این خطاب از برای تـاریخش　　(ای گـل بوستان عثمانی)1251

لەمنداڵیدا گەلێ پەرێشانو بێئارام بوو, دێوانەو بێهێزو بێویقار بوو, دوای ئەوەی باڵق بوو, بوو بەپیاوێکی گەلێ رێکوپێك, بەرادەیەك کەخەڵکی سەریان لەو گۆڕانکارییە سووڕمابوو, وبەیەکێك لەخەوارقی عاداتی حەزرەتی سراجودینیان دادەنا . لەراستیدا گەلێ گۆڕابوو, رەوشتی بەرزو ئارامو بێدەنگو لەسەرخۆ بوو, بڕوای بەرزو راستگۆ وەکو گـوڵی ئاوێتـە بـەگوڵاو ببـوو, گـەلێ خولیـای خوێندنـەوەی کتێبـەکانی پیـاو چـاکان بـوو, وبەخوێندنـەوەی: (تفسـیر المواهـب)و(روضـة الاحبـاب)و(اسـرار الفاتحـة)و(تـذکرة الاولیـاء)و(کیمیـای سـعادت)تـۆوی خۆشـبەختی لەکێڵگـەی بـوونی خۆیدا چاند, تالە ساڵی 1277دا, پۆستەچی مەرگ سەردانی کردو,



دەنگی(یاایتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية)ی هێنا بەگوێیـدا, وگەشـتی بـەرەو مـەنزڵی هەمیشـەگی, لـە روانگـەی (حـب الوطن من الایمان)وەی هەڵبژارد .

ترا کنگرۀعرش می زنند صفیر　　ندانمت کەدراین دامگه چە افتادەاست

بەنـــدە لـــەکاتی کۆچـــی دواییـــدا, بـــەئامادەبوونی هـــەموو پیرزادەکان(خوابیانپارێزێت) ئامادەبووم کەهەموویان بەسەرسەریەوە بـوونو هەرچـەندە هەواڵپرسـییان لێـدەکردو دەیانویسـت دەمـی باسوقسـەی لەگەڵدا بکەنەوە, بەڵکو بکەوێتە قسەکردنو ئامادەبوان شـاد بکـات, بـەلام ئـەو هەربێـدەنگ بـوو, سـەری دەخسـتە ژێـر لێفەکەیـەوەو سـەرقاڵی دۆسـتی خـۆی بـوو, قسـەی کەسـیتری نەدەبیستو لەتابلۆی خەیاڵدا دەیسڕییەوە, لەوەڵامیاندا دەیگوت: بیکەن بەخاتری شای نەقشبەند, وازم لێبهێنن:

باازل خوش با ابد خوش شادوکام　　فارغ ازگفت وشنود خاصو عام

بەندە یەکجار سورەی یاسینم خوێند, دوای ئەوەی لەخوێندنەوەی بوومەوە, شایەتمانم هێناو بەزمانێکی پاراو, چەند جارێك دووبارەی کردەوەو بە(آمنت باللە) دەمی بەتەواوی کردەوەو دوای ئەوە, ئیتر هیچی بەسـەر زاردا نـەهات . ودوای (2)خولـەك لـەم رووداوە, گیـانی پـاکی سـپارد(بـرّداللە مضـجعە وآنـس وحشـتە . آمـین). وبەنـدە ئـەم قەسیدەیەم سەبارەت بەمێژووی کۆچی دوایی کردنی هۆنییەوە:

شیخ معروف آن تذرو دوحهٔ فضل وکمـــال    بلبل دستان سرای روضهٔ حسن وجمـال
آنکـــــه خالی بود سرّش ازخیال غیر دوست    وانکه جانش بود ازاسرار وحدت مال مال
صـــاف مـشرب پاك منظر نيك محضر خوش لقا    نيك طبع وپاك نفس‌و خــوب خوی وخوش خصال
روح پاكش چــــــون فراز اوج علیین رسید    رست ازاین زندان پراشوب وتشویش ونكال
صحن عالم درعزایش پرشد ازجوش وخروش    از فراقش اشك ریزان سینه كوبان اهل حال

×32
=1245
1277

حوریان از تهنیت شادی كنان دستك زنان    خیر مقدم مرحبـــــا برلب پی‌تاریخ سـال
روز دوشنبه ربیع الثانی اثنی عشر بـــود    كه‌جهان برگشت ازین اندوه مكروه ومـلال
خالقا پروردگارا جـــــــرم اورا عفوكن    درجوار قرب خود جایش بده باصد حـلال
والدو مولود, داورهــــــای اوراده فزون    عمرو ایمان وكمال وعزّت واقبـــال ومـال

لەسـالّی 1252دا, جـەنابی پـیرزادەی شـكۆمەندو نـوری دیـدەی ئـەهلی كەشـف‌و شـهود ئەبولبـەها شـێخ محەمـەد (خـودا بیپارێزێـت) لـەدایك بـوو. بەهاتنـە دنیـاوەی, بـۆنی خۆشـبەختی گەیشـتە ئـەهلی ویست‌و ئیرادە:

غوث آفاق شیخ عثمان آنك    قطب عصرو پنـــاه دورانست
آنكه برگر خـوان احسانش    گردهٔ این سپهر گـــردان است
عالم وهرچه هست درعـالم    همه‌چون قالبند واوجان اسـت
گلی ازباغ دولتش بشكفت    زینت هرگـــل وگلستان است
شد مسّما بـاسم خیر رسل    آن محمد كه‌جـان جانان اسـت
هشت مـــاه ربیع آخر كرد    جلوه آن مه‌كه نور ایمان است
هاتفی گفت بهـر تاریخش    ((این گل گلستان احسانست))





لەســالّی 1253دا, خــۆری چــەرخی شــەرەف‌و خــاوەنی زادی میهرەبـانی ئــەبولوەفا شـێخ عەبـدورەحمان (خوداوەنـدی ســەروەر بیپارێزێـت) بەهــەڵهاتنی خـۆی, جیهـانی روونـاك كـردەوەو بـۆن‌و بەرامەی خۆشبەختی هەمیشەگی, بەرۆحی هەواداران گەیاند:

تعالی ان خداوندی كـــــه تصویر كمال او    برون ازحیطهٔ تحریر فكراست وخیال او
بود یك كاسه‌فردوس نعیم ازخوان احسانش    بود یك پایه عرش اعظم ازتخت جـلال او
بهار عیش خرّم پنجم مـــــاه محرم بود    كـــــه‌ازغنچهٔ بشكفت ازباغ نهال او
گل گلزار عثمانی نسیم باغ رحمـــــانی    زهی آئینهٔ حسن خداوندی جمـــــال او
چونامش عبد رحمن گشت شداین نكته مـعلوم    كـــه‌هست ازعین رحمت شخص قدوسی مثال او
زسیمایش چـــوخورنور سعادت میشود لامع    تو برخیز وسعادت ختم كن یارب مـآل او
بفكر اندر فروفتم شنیدم هاتفی گفتــــا    جمال بــــاغ معنیها پی تـاریخ سال او

دوای ئەوەی ئەم دوونەمامی دەڤەری خۆشبەختی پڕبارە, میـوەی مەعریفـەیان بـەدەركی ویـژدان چەشـت, ولەبەرامبـەر بەنـدەدا لوتفیـان نوانـدو گەوهــەری فرمــانی منیــان بەئەلماســی داخــوازی زاخــاودا كەئەگەرچـی ئـەو قەسـیدانەی سـەبارەت بەئێمـە هۆنیونەتـەوە, هـەموو گەوهــەرن, بــەڵام ئەگــەر ناوونازنــاوو كونیــەی ئێمــەی تێـدا بهاتایــە, خۆشــترو جــوانتر دەبــوون, بۆیــە بەنــدەش, بــەپێی ئامــاژەی ئــەو دووپیرزادە پاك ویژدانانە, ئەم قەسیدەیەم هۆنییەوە:

جـــــــان آفرین شخص ممجّد ابوالبها    كرد آفرین حضرت امجد ابو البها
بـــــــاشد كمال طالع واقبال سرمدی    خطّ جبین اكــــرم ارشد ابو البها
حــــــرف سعادت دوجهانیست آشكار    نقش نگین اشرف اسعد ابـو البها
سرنەبرآستانش كه تفش دوكون هست    درآستین شاه مجــــــرّد ابوالبها
خــــــــواهی اگر بفرق فلك پانهی بنه    رخ برزمین كوكب فرقد ابـــوالبها

